46

# خەونامەی

# ابن سیرین



وەرگێرانی :
حسین نەجمەدین

**چوارچرا**
Email \ cwarcra_slemani@yahoo.com
Mobile \ 1575067
١١٢٨٢٨٨

ناوی کتێب : خەونامەی ئیبن سیرین
بابەت : لێکدانەوەی خەون
وەرگێڕانی حسەین نەجمەدین
نۆبەتی چاپ :چاپی یەکەم سلێمانی ٢٠٠٦
چاپخانە :چوارچرا
تایپ :مامۆستا عوسمان
پیاچونەوەی : محەمەد عەلی کورە داوێی
تیراژ : ٢٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن ( ٩٧٧) ساڵی (٢٠٠٥)

# پێڕست

## پیتی (ئـ)

ئـاو : ئەگـەر کەسـێ لەخەویـدا بەسـەر ئـاودا بـڕوات وەك ئـاوی دەریاو ڕوبار، دەلالەت لەبەهێزی بیروباوەڕی دەکات. ئەگەر ببینـێ لـە ئـاوێکی پـاكو بێگـەرد ئەنۆشـێ دەلیلـی ئەوەیـە تەمـەنی زیـاد دەکـات ژیانی پڕدەبێ لە کامەرانی وە ئەگەر ببینـێ لـە ئـاوی سوێر بخواتـەوە واتاکەی پێچەوانەی ئەوەیە وە ئەگەر ببینێ لە ئاوی دەریا کە ئاوێکی بێگەرد بخواتەوە مانـای ئەوەیـە لەلایـەن پادشـاوە یـان دەسـەڵاتدارەوە سەروەتو سامانێکی لە ئەندازە بەدەری بۆ دێ وە ئەگەر ببینێ هەمو ئـاوی دەریاکـەی خـواردەوە مانـای ئەوەیـە پادشـایەك دەسـت بەسـەر هەمو جیهانـدا دەگرێ بەڵام ئەگەر ئاوەکە لیڵ بێت ئەوەی بە دەسـتی دەکات ڕەنـجو نارەحەتیو ترسو بەدبەختی لەگەڵدایە.

ئاوەدانی : ئەگـەر ببینـی جێگەیـەکی کاولت ئـاوەدان دەکـردەوە وەکـو مزگـەوتو قوتابخانـەو تەکیـەو هاوشـێوەکانی ئەوانـە بەڵگـەی ڕێكو دروستی باوەڕو عەقڵو چاکەخوازییەو پاداشتی ڕۆژی کۆتـایی هەیە وە ئەگەر ببینی ماڵی تایبەت بە خۆتت ئاوەدان بکەیتەوە وەکو خانوو دوکان مانای ئەوەیە چاکەی دنیایی بەدەست دێنـی، وە ئەگـەر ببینـی جێگەیـەکی ئـاوەدانی ڕۆبـچێو بڕوخـێ خـەڵکی ئـەو جێگەیـە توشی بەڵاو نارەحەتی دەبن.

ئاوریشم : مانـای بینینـی ئاوریـشم لەخـەودا ئەگـەر سـپی بێـت سـودە وە ئەگـەر زەردبێـت ئەخۆشـییە وە ئاوریـشمی پـاك چـاکترە

لەخام، ئەگەر ببینێ ئاوریشمەکەی ئەو وون بێ یان لەناوبچێ زیان دەبینێ ئەگەر بەرگی ئاوریشمی لەخەودابێت بۆ پیاوان ناپەسەندەو بۆ ژنان چاكو پەسەندە.

**ئیبلیس (شەیتان) :** ئەگەر ببینێ لەگەڵ شەیتاندا شەڕ دەکاتو شەیتان ببەزێنێ ئەوە حەزو ئارەزووی لە دینداری دەبێ وەئەگەر ببینێ شەیتان ئەوی بەزاند پێچەوانەی ئەوی ترە وە ئەگەر ببینێ شەیتان ئامۆژگاری بکاتو حەزی لێ بکات سامانو گیانو دارایی ئەو کەسە زیانی بەردەکەوێت.

**ئاوجۆ (بیرە) :** ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ ئاوجۆ بخواتەوە خزمەتکارێك دەبێتە هۆکاری ئاسایشو ئیسراحەتی ئەو وەگەر بینی ئاوجۆ بە کەسێك بدات لە ماڵو دارایی خۆی بەو کەسە دەبەخشێ.

**ئاوڵە :** بینینی ئاوڵە لەخەودا زیادکردنی سامانە، ئەگەر ببینێ ئاوڵە لە لەشی بدات بە ئەندازەی ئەو ئاوڵەیە ماڵو سامان بەدەست دێنێ.

**ئاگر :** ئەگەر کەسێ لەخەودا ئاگری بێ دوکەڵی بینی نزیك دەبێتەوە لە پادشاو دەرگای داخراوی کارەکانی بەڕویدا دەکرێنەوە، وە ئەگەر ببینێ کەسێ فڕێی دەداتە ناو ئاگرەوە، ئاگرەکە ئەوی نەسوتاند دەکەوێتە ژێر ستەمی پادشاوە بەڵام زوو دەرباز دەبێ وە ئەگەر ببینێ ئاگر ئەوی سوتاند بەبێ حەزو ئارەزو سەفەر دەکات وە ئەگەر ئاگری بەگڕو بە تینی بینی توشی تا دەبێت. وە ئەگەر ئاگر لەشی ئەوی سوتاند بە ئەندازەی سوتاوییەکە ڕەنجو ئازار دەکێشێ وە ئەگەر بینی ئاگر بەربێ لە ماڵەکەیو هەمو لاشەی بسوتێنێ بەڵام

ترس‌و نیگەرانی لەدڵیدا نەبینێ دەلیلی ئەوەیە ئازارو موسیبەتێك کە توشی دەبێت بەهۆی نەخۆشی وەك سەرماو تاعون‌و ئاوڵەو کۆکەوەیە. ئەگەر ببینێ ئاگری تێبەربێ بە ئەندازەی ئەو ئاگرە ماڵی حەرام بەو دەکات وە ئەگەر ببینێ ئاگر لەگەڵ دوکەڵدا پێکەوە بون ئەو ماڵ‌و سامانە حەرامە بە ئاسۆرو زەحمەتەوە بەشەڕو کینەوە بەدەست دێنێ وە ئەگەر ببینێ پریشکی ئاگری بۆدێ کەسێ غەیبەتی ئەو دەکات. ئەگەر بینی ژێری قابلەمە گڕی گرت وە ناو قابلەمەکە گۆشت یان هەر خواردنێکی تری تیابو بەڵگەی ئەوەیە کەیبانوی ئەو ماڵە بەهرەی لێ دەبا وە ئەگەر ببینێ ناو قابلەمەکە هیچ خواردنێکی تیا نەبێ بەڵگەی کاری غەمگین‌و پەژارەییە. ئەگەر ببینێ ئاگری بۆ ڕوناکی هەڵگرێ مانای ئەوەیە کارێك بە بەڵگەوە ڕون دەبێتەوە. ئەگەر ببینێ ئاگری داگیرسان تا گەرم بێتەوە یان کەسێکی تر گەرمی بێتەوە ئەوە بەشوێن شتێکەوەیە سودی لێ دەبات وە ئەگەر بەبێ هۆ ئاگری داگیرساند بەڵگەی ئەوەیە بەبێ هۆ شەڕو دوژمنایەتی دەکات.

**ئاگر پەرستن :** ئەگەر کەسێ ببینێ ئاگر دەپەرستێ‌و کڕنوشی بۆ دەبات مانای ئەوەیە کڕنوش بۆ پادشایەکی ستەمکار دەبات‌و سەرقاڵی خزمەتکردنی ئەو دەبێت بەشێوەیەك کە بێزار دەبێ لێی. وە ئەگەر ببینێ کڕنوشی بۆ ئاگری تەنور یان چرایەك کرد سەرقاڵی خزمەتکردنی ژنان دەبێت.

**ئاگردان :** ئاگردان لەخەودا ژنێکە خزمەتی ماڵەوە دەکات بەڵام ئەگەر ئاگردانەکە ئاسنی بو ئەو ژنە لە نزیکەکانی ئەو ماڵە دەبێت وە ئەگەر ئاگردانەکە تەختە یان داری بو ئەو ژنە لە خزم‌و

خۆیشەکانی ئەو ماڵە نابێت وە دوو ڕووە وە ئەگەر ئاگردانەکە خەڵوزی بو ئەو ژنە سەر کێش و بێ باوەڕەکان دەبێت.

ئاگرکێش مقاش : ئاگرکێش و بەردی ئاگردان دوو شەریکن کەیەکێ بەهێزو دلێرو ئەوی تریان دڵ ڕەق وە هەردوکیان پێکەوە خەلکی بۆ شەرەف و سەرفرازی و کارگەلێ گرنگ وا دار دەکەن.

ئازادبون : دانیاڵ (ع) ئەڵێ : کەسێ لەخەودا ببینێ ئازاد بکرێ وەیان کەسێك ئەوی ئازادکرد ئەگەر نەخۆش بێت چاك دەبێتەوە وە ئەگەر قەرزاربێت قەرزەکەی دەداتەوە وە ئەگەر بۆ حەجکردن نەڕۆشتبێ بۆ حەج دەڕوات وە ئەگەر کۆیلەش بێت ئازاد دەکرێ وە ئەگەر گوناهکاربێت دەگەڕێتەوە سەر ڕێگای ڕاست.

ئاشتی کردن : ئەگەر لەخەودا بینی کەسێك ئاشتی کرد تەمەنی درێژ دەبێ وە ئەگەر بینی لە ئاشتیدا کەسێك بو گەندەڵی لەدینـدا بانگ بکرێ مانای ئەوەیە ئەو کەسە بۆ چاکسازی و دروستکاری بانگ دەکرێ وە ئەگەر ببینێ لەکاتی توڕەبون ڕق و کیندا کەسێك بۆ دینداری بانگ بکەن، مانای ئەوەیە ئەو کەسە بۆ فەسادکاری و گومڕایی بانگ دەکرێ.

ئارد : مانای بینینی ئاردی جۆ بەهێزی ئیمانە وە ئاردی گەنم سامانێکی پڕ سودە کە لە بازرگانییەوە بەدەست دێت وە ئاردی هەرزن سامانی کەمە بەلام بەگشتی بینینی ئارد لەخەودا مانای سامانی حەلالە کە بەبێ ڕەنج و زەحمەتەوە بەدەست دێت.

ئاسمان : ئەگەر کەسێ لەخەودا خۆی لە ئاسماندا ببینێ سەفەرێك دەکات لەو سەفەرەدا پلەوپایەو سەرفرازی بەدەست دێنێت

وه ئەگەر ببینێ لەپانایی ئاسماندا بفڕێ بۆ سەفەرێکی پڕ لە نیعمەت دەڕوات وە ئەگەر ببینێ ڕاستەوخۆ بفڕێ تا بگاتە ئاسمان زیانو گەزەندو ڕەنجی توش دەبێ. وە ئەگەر بینی بۆ ئاسمان ڕۆیشتو بەو نیازەی کە ئەگەڕێتەوە سەرزەوی گەورەییو پاشایەتی پەیدا دەکاتو شوێن مەبەستێکی گەورە دەکەوێو دەستی دەکەوێت وە ئەگەر لە ئاسماندا بانگەوازی بیبست بەڵگەی خێرو سەلامەتی هەیە وە ئەگەر ببینێ باڵندەیەك لەگەڵ ئەودا لە ئاسمان قسە بکات مانای ئەوەیە شادمان دەبێت.

ئاش : مانای ئاش لەخەودا شەڕو ناکۆکییە ئەگەر کەسێك خۆی لە ئاشدا بینی یەوە لەگەڵ کەسێکدا شەڕ دەکات بەڵام ئەگەر بزانێت ئاشەکە خۆی خاوەنییەتی ئاسانتر دەبێت وە ئەگەر دانەوێڵە لە ئاشەکەدا نەبو بەڵام سەیری سوڕانەوەی ئاشەکە بکات مانای ئەوەیە سەفەر دەکات وە ئەگەر بەرداشی ئاشەکە مس یان برنجە وەیان ئاسن بێت بەڵگەی شەڕو ناکۆکییە وە ئەگەر بەرداشی ئاشەکە شوشە بێت لەگەڵ ژندا شەڕو ناکۆکی دەبێت وە ئەگەر ببینێ لە ئاشەکەدا بەجێی دانەوێڵە بەردو ئاسن بهاڕێ لەنێوان ئەوو کەسێکدا شەڕو ناکۆکی پەیدا دەبێت وە ئەگەر ببینێ ئاشەکە بەدەست بگێڕێ شەریکێکی بێ ڕەحمی دەبێ کە لەگەڵیدا سەرمایە بەدەست ناهێنێت.

ئاشەوان : ئاشەوان لەخەودا کەسێکە ڕزقو ڕۆزی خەڵکی بەدەستە، ئەگەر ئاشەوان لەخەودا گەنج بێت مانای خێرە وە ئەگەر ببینێ ئاش بەهۆی کەر یان حوشترەوە بچەرخێو ئاردی باشی لێ بێتە دەرەوە ئاشەوان خێرو کامەرانی دەهێنێ وە ئەگەر لەکاتی سوڕانەوەی ئاشەکەدا گوێی لەدەنگی بەرداشەکە بو کارەکەی بەرەو

پێش دەڕوات. ئاواز : ئاوازی پیاو لەخەودا ئەگەر بەرزبێت لەنێوان خەڵكیدا پلەوپایەی بەرز پەیدا دەكات ئەگەر ببینێ ئاوازی بەرزبویەوە بە ئەندازەی ئەو ئاوازە بەرزە ناوی بەرز دەبێتەوە وە ئەگەر ئاوازی لاوازبێت ناوی لاواز دەبێت بەشێوەیەكی وا لە كۆمەڵگادا كەسێك ناوی ئەو ناهێنێت.

ئاواز خوێندن : ئەگەر كەسێ لەخەویدا ببینێ ئاوازخوێنی بكاتو سازو ئامێرە مۆسیقیەكان لێ بدات بەڵگەی ئەوەیە حەزی لەكاری حەرامە، بینینی ئاواز خوێندن لەخەودا هیچ سودێكی نییە.

ئاهەك (قسل) : ئاهەك كردن لەخەودا بۆ كەسی بەتوانا زیادكردنی تواناكەیەتی وە بۆ هەژار دانەوەی قەرزەكانییەتی وە بۆ كافر موسڵمان بونییەتی.

ئاسن : ئەگەر ببینێ كەسێك ئاسنی پێ بدات بە ئەندازەی ئەو ئاسنە ماڵو سامانی بەئەو دەبەخشرێ وە ئەگەر ببینێ ئاسن یان مس بتاوێنێتەوە غەیبەتو خراپگۆی خەڵكی دەكات.

ئاوێنە : ئاوێنە لەخەودا پلەوپایەو فەرمان ڕەواییە ئەگەر ببینێ ئاوێنەیەك بەكەسێ بدات سامانو دارایی خۆی لەلای كەسێك دادەنێ وە ئەگەر سەیری ئاوێنەی زیو بكات لە پلەوپایەی خۆی زەحمەتو ناڕەحەتی دەبینێ چونكە خەوناسەكان ئاوێنەی زیو بە ناپەسەند ئەزانن.

ئالآ : ئالآ لەخەودا لێكدانەوەی پیاوێكی زانا، زاهر، پێشەوا، دەوڵەمەند، وەیان كەسێكی سەخیە، ئەگەر لەخەودا بینینی ئالاكە هەبێت بەڵگەی ئەوەیە كە لەو كەسانەوە سودو قازانجی پێدەگات.

ئەگەر بینی ئالآکە بکەوێت یان وون ببێت لێکدانەوەی پێچەوانە دەبێت.

ئاڵو : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ئاڵوی سور یان ڕەش ببینێ لەوەرزی خۆیدا بەڵگەی ئەوەیە سامانێك دەدۆزێتەوە، بینینی ئاڵوی زەرد بەڵگەی نەخۆشییە، ئەگەر ئاڵوی شیرینی زەرد یان سور یان ڕەشی پێ بدرێت یان خۆی هەیبێت بەڵگەی ئەوەیە بەو ئەندازەیە سەروەت پەیدا دەکات ئەگەر ئاڵوی زەردی هەبێت کە لەوەرزی خۆیدا نەبێت ئەوا دوچاری غەمو پەژارە دەبێت.

ئارەق کردن :ئەگەر کەسێك لەخەودا بینی ئارەق بەلەشدا بێتە خوارەوە ئەوا بە ئەندازەی ئەو ئارەقە لەسەروەتی کەم دەبێتەوە بەتایبەت ئەگەر ئارەقەکەی بکەوێتە سەرزەوی، ئەگەر بینی ئارەق جلو بەرگەکەی تەڕ بکات ئەوا بە ئەندازەی ئەو ئارەقە لەسەروەتەکەی دەدات بە هاوسەرەکەی، ئەگەربینی ئارەقەکەی سپی و بۆن خۆش بێت ئەوا بەڵگەی ئەوەیە سەروەتەکەی پاك و حەڵاڵە وە ئەگەر پێچەوانەی بینی بەڵگەی ئەوەیە سەروەتەکەی حەرامە. ئەگەر نەخۆشێك لە خەویدا ئارەق ببینێ چاك دەبێتەوە و بە ئارەزوەکانی دەگات.

ئامۆژگاری کردن : ئەگەر کەسێ ببینێ کەسێ ئامۆژگاری دەکات کە تێیدا خێری دینو ڕاست کرداری تێدابێ مژدەیەکی خۆشە بۆ ئەو کەسە خێری دینو دنیای تێدایە، وە ئەگەر پێچەوانەکەی ببینێ فەسادی دینو دنیای ئەو کەسەیە.

ئامۆژگاری کار : ئەگەر کەسێك لەخەویدا ببینێ ئامۆژگاری خەڵکی دەکات شادمان دەبێت، ئەگەر نەخۆشێك ئەم خەوە ببینێ چاك دەبێتەوە، ئەگەر ببینێ ئامۆژگاری کەسێك بکات کە لەو ئامۆژگارییەدا بەرژەوەندی دین‌و دنیای تێدابێت کاروباری دین‌و دنیای باش‌و بەرەو پێش دەچێت.

ئامانەت (( سپاردن )) : ئەگەر کەسێك لەخەویدا بینی شتێك بە کەسێك بسپێرێت بەڵگەی ئەوەیە کە ئەوشتەی بۆ دەمێنێتەوە و بەهرەی لێدەبات.

ئاڵتون : (( زێڕ )) : لە خەودا بینینی ئاڵتون بۆ پیاوان غەم و پەژارەیە. بەڵام بۆ ژنان چاك و پەسەندە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ئاڵتون بدۆزێتەوە یان کەسێك پێی بدات ئەوا سەروەتی لەدەست دەدات وەیان غەرامەیەکی دەکەن وەیان کەسێ رقی لێ هەڵدەگرێ.

ئاودەستخانە : دروستکردنی ئاودەست لەخەودا بەڵگەی سوربونە لەسەر کۆکردنەوەی پارەو پول‌و هیچی لێ نەبەخشێ‌و خەرج نەکات، ئەگەر لەخەودا میزو پیسی بکات بەڵگەی ئەوەیە لەسەروەتی خۆی خەرج دەکات، ئەگەر لەخەودا بکەوێتە چاڵی ئاودەستەوە بەڵگەی ئەوەیە سەرگەرمی کۆکردنەوەی پارەو پول دەبێت، ئەگەر ببینێ کەسێکی تر بکەوێتە چاڵی ئاودەستەوە بەڵگەی ئەوەیە بەزۆر پارە لەخەڵکی دەسێنێ، ئەگەر لەخەودا بکەوێتە چاڵی ئاودەستەوەو دەست‌و قاچی بشکێ بەڵگەی ئەوەیە دوچاری بەڵایەك دەبێتەوە.

ئاسك : ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی بێ ئەوەی شكاو بكات ئاسكێك راوبكات یان تۆو بوەشێنێت كە نێرەكێك یان ژنێك هەڵدەگرێت وە ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی لە شكاركردندا ئاسكێك راوبكات دەوڵەمەندی بەدەست دێنێ. وە ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی ئاسك لە ماڵەكەیدا بمرێت بۆ ژنەكەی دەكەوێتە غەم و پەژارەوە. وە ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی بەرد یان تیر بدات لە ئاسك قسەی خراپ و ناشیرین بە ژنەكەی دەڵێت.

ئەسپ : ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی بەڕوتی سواری ئەسپ بوە ئازار و گوناهی زۆرتر دەبێت ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی ئەسپ ڕوت و قوت بێت بەلاّم دەستەمۆ بێت بەلگەی بەرزی پلەو پایەیە. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی سواری ئەسپ بوە وە ئەسپەكەش لەسەر بان یان دیوار راوەستابێت دوچاری گوناهی گەورەتر و سەخت تر دەبێت ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی سواری ئەسپ بوە و ئەسپەكەش لە هەوادا وەكو باڵندەكان باڵدار بێت و بفرێت شەرەفی گەورەی لە دین و دنیادا دەست دەكەوێت وە لەوانەشە سەفەر بكات.

ئەسپێ :ئەگەر كەسێك لە خەویدا ئەندازەیەكی زۆر ئەسپێی بەسەر لەشیەوە بینی یان ئەسپێ تێی دابوو سەروەت و سامانی زیاد دەكات.

ئەشكەنجە : ئەشكەنجە لەخەودا بەلگەی بێچارەییە. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی كە كەسێك ئەشكەنجە بدات ئەوا ئەوكەسە لەنێوان خەلكیدا رسواو زەلیل دەكات.

ئەڵقەی پەنجە (مستیلە) : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ مستیلەی وون ببێت یان دز بیدزێت لە کاروبارەکانیدا ئافات و دژواری دەبینێت وە ئەگەر مستیلەکەی شکاو نگینەکەی بمێنێتەوە پلەوپایەی ئەو نامێنێ و ئابڕو ڕێزی لەکەدار دەبێت، وە ئەگەر نگینی مستیلەکەی بشکێ ئابڕو ڕێزی لەناو دەچێ و پایەی لە جێی خۆی دەمێنێتەوە، وە ئەگەر مستیلەکەی خۆی بە کەسێ بەخشی بەشێك لە سامانەکەی دەبەخشێ، وە ئەگەر مستیلەکەی خۆی بفرۆشێ و بەهاکەی وەرگرت هەموو داراییەکەی خۆی دەفرۆشێ و خەرجی دەکات، وە ئەگەر بەهاکەی وەرنەگرێت بەشێك لە سامانەکەی دەفرۆشێ.

ئەیوان (تاق) : لەخەودا بینینی تاقی ماڵ، مانای دایك و باوکە. ئەگەر تاقی خۆت تازەو بەرزببینی، تەمەنی دایك و باوکت درێژ دەبێتەوە وە ئەگەر ببینێ تاقی خانوەکەی خراپ بێ، پێچەوانەی ئەوەیە.

ئەستێرە ناس : ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ بووبێت بە ئەستێرە ناس بەڵگەی ئەوەیە لە نێو گەورە پیاواندا پلەو پایەی دەست دەکەوێت بەڵام درۆ دەکات.

ئەژدیها : مانای ئەژدیها لەخەودا دوژمنایەتییە ئەگەر ببینێ لەگەڵ ئەژدیهادا شەڕی کردو بەزاندی لەگەڵ دوژمندا دەجەنگێ و دەیبەزێنێ ئەگەر ببینێ ئەژدیهاکەی کوشت و گۆشتەکەی خوارد بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێت سەروەت و سامان وەردەگرێ و خەرجی دەکات.

ئێسقان : مانای ئێسقان لەخەودا سامانێکە بژێوی و ژیانی مرۆڤی لەگەڵدایە، ئەگەر ببینێ ئێسقانی بەدەستەوەبێ و ئەو ئێسقانە گۆشتی پێوەبو بە ئەندازەی ئەو گۆشتە خێرو سامان بەو کەسە دەگات، ئەگەر بینی گۆشتی پێوە نەبو قازانجێکی ئەندەکی پێ دەگات وە ئەگەر ببینێ ئێسقان بەکەسێ بدات لەو کەسەوە بۆ ئەو خێرو چاکەی پێ دەگات.

ئەشك : کرمانی ئەڵێ : ئەگەر خەوببینی فرمێسکی سارد لەچاوت بێتە خوار خۆشحاڵ و شادمان دەبیت وە ئەگەر ببینێ فرمێسك لەچاوی بێتە خوار غەمگین و پەژارە دەبێت وە ئەگەر ببینێ بەبێ گریان فرمێسك بەرومەتییەوە بو قسەی ناخۆش و ناشیرین دەبیسێ وەئەگەر ببینێ فرمێسك بەروخساریدا هاتە خوار سامانی خۆی خەرج دەکات.

ئەشکەوت : ئەگەر کەسێك لەخەویدا بۆ ئەشکەوت بڕوات و لێی نیشتەجێ بێت ئەوا بە زوویی دەمرێت. ئەگەر ببینێ بچێتەناو ئەشکەوتەکە بەڵام بێتە دەرەوە ئەوا سەرگەرمی کارێکی سەخت دەبێت، ئەگەر ببینێ بچێتە ناو ئەشکەوتێکەوە کە روناك بێت ئەوا زیندانی دەکرێت و دەمرێ.

ئەژنۆ : بینینی ئەژنۆ لە خەودا بەڵگەی بژێوی بینەری خەوەکەیە. ئەگەر ببینێ ئەژنۆی شکاوبێ ئەوا کارو کاسپی بێ رەونەق دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ئەژنۆی گەورە و بەهێز بووبێت ئەوا کارو کاسپی چاك و رووڵە زیادبوون دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەسەر ئەژنۆ بەرێدا بڕوات ئەوا

كارو كاسپيەكەی لاواز ز بێ ڕەونەق دەبێت. ئەگەر كەسێك لە خەويدا بينی كڵاوی ئەژنۆكەی شكابێت ئەوا چاوەڕێی دەستی خەڵكی دەكات. ئەگەر كەسێك لە خەويدا بينی كڵاوەكەی ئەژنۆی داكەوێت ئەوا سەروەت و سامانی لەدەست دەدات.

ئێشی لەش : ئەگەر كەسێك لە خەويدا بينی هەموو لەشی ئێش و ئازاری هەبێت ئەوا سەروەتەكەی لەكيس دەچێت وە ئەگەر كەسێك لە خەويدا بينی سەری ئێش و ئازاری هەبێت ئەوا دوچاری گوناهی زۆر دەبێتەوە و پێويستە تەوبە بكات و خێرو خێرات بكات.

ئيفليجی : ئەگەر كەسێ لەخەويدا ئيفليج بێت بەڵگەی ئەوەيە لە كارەكانيدا دەستەو ئەژنۆ دەمێنێتەوە، ئەگەر ئيفليجێك ببينێ چاك بوبێتەوە ئەوا لە كارەكانيدا بەرەو پێش دەڕوات وە ئەگەر لەخەويدا ببينێ ئيفليجيەكەی زكماكی بێت ئەوا لە تاوانەكان‌و گوناحەكانی تۆبە دەكات، ئەگەر ببينێ ئيفليجێك بە ئەژنۆكانی بەڕێدا بڕوات ئەوا دەستكورت‌و هەژار دەكەوێت، ئەگەر ببينێ كەسێك ئيفليج ببێت‌و لەزەويدا بكەوێت ئەوا زەرەرو زيان بە كەسێك دەگەيەنێت.

## پیتی ( بـ )

بانگ (بانگی نوێژ) : هەرکەسێ لەخەویدا ببینێ بانگ بدات لە شوێنێکی دیارو ناسراودا ئەو کەسە بۆ حەج دەڕوات.

بادام : بینینی بادام لەخەودا ڕزق‌و ڕۆزییە بەڵام بەشەڕو ناکۆکی بەدەست دێت، ئەگەر ببینێ بادام بەدەستەوە بگرێت بە ئەندازەی ئەوە ڕزق بە دژوارییەوە بەدەست دێنێ هەندێکیش دەڵێن بادام لەخەودا زانست‌و شیفایە لەنەخۆشی، وە ئەگەر ناوکی بادام ببینێ باشترە.

باخ : دانیال (ع) دەڵێ : بینینی باخ لەخەودا ژنە، ئەگەر ببینێ باخ ئاو دەدات لەگەڵ ژنەکەی خۆیدا جوت دەبێت، وە ئەگەر باخی ئاودا بەڵام تەڕنەبوو ژنەکەی جوت بون‌و ژن‌و مێردایەتی لێ دەوێ وە ئەگەر ببینێ لەباخدا گوڵ‌و ڕێحانە بڕوێنێ منداڵێکی ساڵح‌و چاکی لێ پەیدا دەبێ، وە ئەگەر ببینێ لەباخدا هەڵوژە دەڕوزێنێ منداڵێکی لێ پەیدا دەبێت کە بە خێرایی زانست‌و هونەر فێردەبێ وە ئەگەر ببینێ لە باخدا ڕێحانەی ڕواندو گەشە بکات‌و بۆنەکەی بگاتە شام منداڵێکی دلێرو داناو بەغیرەتی لێ پەیدا دەبێت وە ئەگەر ببینێ باخەکەی ئاوەدان‌و سەرسەوزو پڕ لەمیوەو ئاوبێت وە لە میوەکانی خوارد لەگەڵ ژنەکەی خۆیدا لە گەشت‌و سەفەردابوو مانای ئەوەیە کە خەڵکی بەهەشتن. وە ئەگەر ببینێ لە باخێکی ئاوەداندا بێ وە لە میوەی درەختەکانی خوارد لەگەڵ ژنێکی

سەرمایەداردا هاوسەرگیری دەکات وە لەو ژنەوە ماڵو سامانی پێ دەگات وە ئەگەر ببینێ لە وەرزی پایزدا بۆ باخێکی نا ئاشنا ڕۆشتو گەڵای درەختەکان گەڵارێزانیان بێت دوچاری خەمو پەژارە دەبێتەوە وە ئەگەر ببینێ لە باخێکدا بێت کە پڕ بێت لە کۆشكو ماڵی جوانو سەرسەوزو ئاوی ڕەوانو درەختی جوان وە ژنێکی جوان بانگی لێ کرد بە پلەی شەهیدی دەگات وە لە کۆتاییدا بە بەهەشتو حۆری پاداشت دەدرێتەوە وە ئەگەر ببینێ باخێکی هەیە وەیان کەسێك باخێك بەو بدات وە لە میوەی ئەو باخەی خوارد ئەوا ژنێکی سەرمایەدار دەهێنێ وە ئەگەر ببینێ لەباخدا بەسەر درەختێکەوە خەوتووە ئەوەو منداڵی ئەو زیاد دەکات.

باران : ئەگەر کەسێ ببینێ کە بارانێکی توندو لەناکاو باری بەسەر لەشکر یان سوپای ئەو شوێنەدا بەڵاو غەم دەبارێ، وە ئەگەر بینی کە بە ئاوی باران مەسحی کرد لە ترسو لەرز بەدوور دەبێ وە ئەگەر ببینێ باران بەسەر سەری ئەودا باری سەفەر دەکاتو بە قازانجەوە دەگەڕێتەوە وە ئەگەر بینی باران وەکو لافاو بەسەر خەڵکیدا باری لەو جێگەیەدا مردنی لەناکاو پەیدا دەبێ وە ئەگەر ببینێ لەگەڵ هەر دڵۆپێکی باران دەنگو ئاوازی لەگەڵدابێ، پلەوپایەی ئەو کەسە بەرزتر دەبێتەوە وە ئەگەر ببینێ بارانێکی زۆر باری بە شێوەیەك کە جۆگەلەی لێ پەیدابێ بەڵام زیان بەو نەگات پادشا دڵ ڕەق دەبێ بەڵام زیانی بۆ ئەو نابێ، وە ئەگەر ببینێ لەو جۆگەلانە نەتوانێ بپەڕێتەوە شەڕی پادشا لەخۆی دوور دەخاتەوە، وە ئەگەر ببینێ بارانی زۆر بە باوە باری، ئەشکەنجەی خواییو نەخۆشی لەو جێیەدا پەیدا دەبێت.

بارانی (ئەو بەرگەی دژە بارانە) : ئەگەر کەسێ بینی کە بارانی لەبەر کردووەو لەلای پادشا بێت، ناو چاکی ئەو کەسە لە نێو خەڵکیدا دەردەکەوێ، وە ئەگەر قوماشی بارانییەکەی ئەو لە جۆری برد بێت (ئەو جۆرە پارچە کەتانییە کە لەیەمەندا دروست دەکرێت) سودەکانی دین‌و دنیایی دەبێ.

بارکێشان (کۆڵ کێشان) : ئەگەر ببینێ کۆڵێکی سوکی لەکۆڵدابێت بە ئەندازەی جۆری ئەو کۆڵە سود بەو کەسە دەگات، وە ئەگەر ببینێ کۆڵێکی قورسی بەکۆڵەوە بێت گوناحێکی زۆر گەورە دەکات.

بازوو : بازوو لەخەودا برا یان کوڕ وە یان هاوڕێیەکی چاکە، ئەگەر بازووی بەهێزو بە توانی بینی لەو کەسانەدا سودی پێ دەگات، وە ئەگەر بازووی لاواز ببینێ هیچ سودو کەڵکێکی لەو کەسانەدا بەدەست ناگات وە ئەگەر ببینێ بازووی لێ بویەوە وە یان کەسێك بازووی لێ کردەوە برایان هاوڕێ یان شەریکی دەمرێت ویان لێیان دوور دەکەوێتەوە.

بارمتە : ئەگەر کەسێ لەخەویدا خۆی بە بارمتە دانا بەڵگەی ئەوەیە خۆی لەگوناح‌و تاوان بەدور دەگرێت، ئەگەر منداڵەکەی خۆی یان خێزانەکەی بە بارمتە دابنێ بەڵگەی ئەوەیە کەسێك ستەمی لێ دەکات، ئەگەر کەسێك خۆی کردە بارمتە لەلای ئەو ئەوا ئەو کەسە پێویستی بەو دەبێت.

بالێ بەربون : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ لەنێوان کۆمەڵێکدا بای لێ بەربویەوەو خەڵکی گوێی لێ بێ، قسەیەکی خراپ

دەكات كە خەڵكى سەرزەنشتى دەكەن بە شێوەيەكى وا لە نێوان خەڵكيدا ڕسوا دەبێت وە ئەگەر باى بێ دەنگى لێ بەربويەوەو خەڵكى گوێى لێ نەبێ پێچەوانەى ئەوەيە.

**بانگەوازكار** : ئەگەر كەسێك ببينێ كە هاوار دەكاتو ئەوەى كە دەيڵێ لەگەڵ زانستو بنەماكانى ڕاستيدا گونجاوبێتو خۆشى پياوێكى دروستكارو ساڵح بێت، بەڵگەى خێرو بەرەكەتو چاكييە.

**باينجان** : خواردنى باينجان لەخەودا چ بە سوركراوەيى چ بە كاڵى چ لەكاتى خۆيداو چ تەڕ بێت يان ووشك غەمو پەژارەيە بەو ئەندازەيەى كە دەيخوات.

**با هەڵكردن** : ئەگەر كەسێك لەخەويدا بينى بايەكى توند هەڵبكات خەڵكى ئەو جێگەيە دوچارى ترسو لەرز دەبن وە ئەگەر ببينێ ڕەشەباكە ئەوەندە توندبێت بە شێوەيەك كە دارو درەخت هەڵبكەنێت وێرانە بە شوێن خۆيدا دێنێت خەڵكى ئەو جێگەيە دوچارى نەخۆشى تاعونو كۆلێراو هاوشێوەكانى ئەوانە دەبن.

**باخ** : ئەگەر كەسێك لە خەويدا بينى لەباخدا ڕۆ بچێت ئەوا زانستى پڕو پوچ واز لێدێنێ و ڕێگاى راست دەگرێتە بەر.

**باڵندە** : ئەگەر ببينێ باڵندەيەكى هەيە لە دەستى بەربێو دوبارە بيگرێتەوە ئەو كەسە پێداويستييەكانى ڕۆژانەى دەست دەكەوێتەوە، وە ئەگەر بينى باڵندەكە لە دەستى بفرێو نەيگرێتەوە بەشێكى سەروەتو سامانى لە كيس دەچێت.

**بانگكردنى ئاژەڵەكان** : بانگكردنى ئاژەڵەكان و مرۆڤەكان لە خەودا بەڵگەى غەم و پەژارەيە لەو شوێنەدا. ئەگەر كەسێك لە

خەویدا بینی  لە شوێنێکی دورەوە بانگیان لێکرد وە ئەویش وەڵامی دایەوە ئەوا دەست بەجێ ئەمرێت بەڵام ئەگەر وەڵامی نەدایەوە ئەوا ئەخۆش دەکەوێت، ئەگەر بینی دەنگی گریان بێت ئەوا خۆشحاڵ دەبێت ئەگەر دەنگی هاوار و ناڵە ببیسێ ئەوا قسەی ناپەسەندی پێدەڵێن وەئەگەر دەنگی هاوار و زاری ببیسێ ئەوا پێداویستیەکانی دەستەبەر دەبن و بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێت وە ئەگەر جنێو ببیسێ ئەوا شتێکی ناپەسەند و ناشیرینی پێدەگات بەڵام بەخێرایی لادەچێت.

بەیانی ( بەرەبەیان )) : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەیانی ساف و بێگەرد و هەوا پاك بێت بەڵگەی ئەومیە خەڵکی ئەو جێگەیە ئاسایش پەیدا دەکەن. ئەگەر بینی پاش روناکی دوبارە هەوا تاریك بوو ئەوا لێکدانەوەکەی بە پێچەوانەوە دەبێت.

باز : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی  بازێك بگرێت وەیان کەسێك پێی بدات وە ئەو بازەش دەستەمۆبێت بەشێوەیەك کە لەسەر دەستی بنیشێتەوە ئەوا ئەو کەسە گەورەیی دەست دەکەوێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی  بازێکی سپی لەسەر دەستی بنیشێتەوە لەلایەن پاشاوە پلەو پایەی دەست دەکەوێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی  باز لەدەستی بکەوێت و بمرێت لە پلەو پایەو دەوڵەمەندیەوە دەگۆڕێت بۆ پەژارەیی‌و هەژاری.

بنێشت : ئەگەر ببینی لەخەودا بنێشت دەجویی، بەشەڕو نارەحەتی سامان بەدەست دێنی. ئەگەر بینی بنێشتی خستە سەر ئاگر بە ئەندازەی ئەوە لە سامانەکەی کەم دەبێتەوە. قرقێنەی زۆر

: ئەگەر ببینێ قرقێنەی ترش‌و ناخۆشی کرد، قسەیەك دەکات زیان بەخش‌و دژوار دەبێ بۆی وە ئەگەر ببینێ قرقێنەی دوکەڵاوی کرد. بەبێ هۆو بەڵگە هەر لەخۆیەوە قسەیەك دەکات کە دەبێتە هۆکاری سەرزەنشت کردنی وە سەر ئەنجام لێی پەشیمان دەبێتەوە.

**بەور (( بەبر ))** : بەور ئاژەڵێکی دڕندەیە بینینی لەخەودا بەڵگەی دوژمنی بەهێزو ئازایە بەڵام میهرەبانیشە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەگەڵ بەوردا بەجەنگ بێت و زاڵبو بەسەریدا ئەوا بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی و لێی بترسێ و بەدەست بەورەوە شکست بخوات ئەوا بەدەست دوژمنەوە شکست دەخوات.

**بەرچاك (پشتوێن - توێشەبەرە - چارەکە)** : ئەگەر لەخەودا ببینێ کە پشتوێن یان توێشەبەرەی پانی ڕاخست‌و لەسەری دانیشت ڕزق‌و ڕۆزی زۆر دەبێ‌و تەمەنی درێژ دەبێت.

**بەشکردن** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ (بیت المال)ی بە ڕێکوپێکی بەسەر خەڵکیدا دابەش بکات ئەوا لە کۆمەڵگادا بە دادپەروەری ڕەفتار دەکات، ئەگەر ببینێ ماڵی خۆی بە ڕێك‌وپێکی دابەش بکات ئەوا هاوسەر دەگرێت بۆ منالەکانی بەڵام ئەگەر ببینێ ماڵەکەی خۆی بە نادروستی دابەش بکات ئەوا حاڵ‌و وەزعی خراپ دەبێت.

**بەخشین** : ئەگەر لەخەودا ببینێ کە ماڵی خۆی لە ڕێگای خێردا ببەخشێ بۆ کوڕ یان یەکێ لە نزیکەکانی خۆی ژن دەهێنێ ماڵی خۆی لە نێوانیاندا دابەش دەکات. وە ئەگەر ماڵی خۆی لە ڕێگای

فەساد دا بەخشی بەرەو فەسادو حەرام ئارەزوو پەیدا دەکات. وە ئەگەر ماڵی خۆی بە بێگانەکان بەخشی سامانەکەی لە کاتی ژیانی خۆیداو لە پاش خۆی پەرتەوازە دەبێت.

**بەفر** : مانای بەفر لەخەودا، پەژارەو غەم‌و ئەشکەنجەیە مەگەر ئەوەی کەمێ ببینێ، وە ئەگەر لە زستاندا لەخەویدا بەفر بباریێ یان لەو جێیەی کە هەمیشە بەفری لێ دەبارێ، بەسەر خەڵکی ئەو جێیەدا غەم‌و پەژارە دەبارێ.

**بەرسیلە** : (( هاڵە )) : ئەگەر کەسێك بینی لە خەویدا بەرسیلە بخوات کە لە وەرزی خۆیدا بێت ئەوا بەسەختی و ناڕەحەتی سەروەت بەدەست دێنێ .

**بەراز** : مانای بەراز لەخەودا پیاوێکی پلەوپایە بەرزو دژوارە چونکە پارچەو جل‌و بەرگ لەخەودا بە درهەم‌و دینار دەکڕێ‌و دەفرۆشێ وە مانای درهەم‌و دینار لەخەودا شتێکی خراپ‌و ناپەسەندەو هیچ خێرێکی تێدانییە. بەڵام ئەگەر ئاڵوگۆڕکردنی جل‌و بەرگ لەخەودا درهەم‌و دینار نەبێت چاکی‌و خراپییەکەی بەندە بە جۆری ئەو شتەی کە ئاڵوگۆڕی پێ دەکات.

**بەرگی شمشێر** : ئەگەر کەسێك لەخەویدا ببینێ شمشێرەکەی لە بەرگەکەی دەر بهێنێ بەڵگەی ئەوەیە کە هاوسەرەکەی کوڕێکی دەبێت و وەلێکدانەوەی کار یان خنجەر هەمان شتە.

**بەندە** : ئەگەر کەسێ بەندەو نۆکەرێکی نابالغی لە خەودا بینی کە بالغ بووبێ ئەوا ئەو بەندەیە ئازاد دەبێت. وە ئەگەر ببینێ بەندەیەکی ئازادکرد ئەوا ئەو کەسە زوو دەمرێت، وە ئەگەر ببینێ

بەندەکە خاوەنەکەی خۆی بفرۆشێ ئەوا غەمگین‌و پەژارە دەبێت، وە ئەگەر ببینێ بەندەکەی بفرۆشێ ئەوا شادمان دەبێت.

بەرد : لێکدانەوەی جۆرەکانی بەرد لە خەودا نارەحەتیە لە کارەکاندا. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەرد لە ژێر ئاودا کۆبکاتەوە ئەوا بە فرت و فێڵ و زەحمەت ئەندازەیەك سامان کۆدەکاتەوە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە کێودا بەرد هەڵبکەنێت ئەوا لە پیاوێکی گەورە و دڵ ڕەق بە فرت و فێڵ سەروەت بەدەست دێنێ. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە بیاباندا بەرد کۆبکاتەوە ئەوا لەسەفەردا بە فرت و فێڵ سامان کۆدەکاتەوە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەرد بەرەو لای یەکێك بهاوێژێت ئەوا بەبێ حەزو مەیل شتێکی خۆی بە کەسێك دەدات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چەو یان وردە بەردی هێنا بۆ ماڵەکەی خۆی ئەوا بەو ئەندازەیە سەروەت و سامان بەدەست دەهێنێت.

بەقاڵ : بینینی بەقاڵ لەخەودا کۆشش کردنە لە کارەکاندا بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیان‌و دەستەبەرکردنیەتی، وە ئەگەر ببینی بەقاڵی دەکەیت بە کارو کاسبیەوە سەرگەرم دەبیت بە ئەندازەی ئەو کاڵایانەی کە لە خەوەکەدایە سەروەت‌و سامانی دنیا بەدەست دێنیت.

بەهێ : لێکدانەوەی بەهێ لەخەودا بەڵگەی نەوخۆشی یە. هەرچەند ڕەنگی بەهێ کەزەردتر بێت نەخۆشی یەکە سەخت تردەبێت.

**بەرماڵ :** ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەمزگەوت دابنیشێ ئەوا سەفەری حەج دەکات. بەتایبەت ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە مزگەوتدا سەرگەرمی بەندایەتی بێت.

**بەڕە (جۆرە فەرشێکی کۆنە) :** لێکدانەوەی بەڕە لەخەودا پیاوێکی ساڵحو دیندارو گەورەیە.

**بەڕو :** بینینی بەڕو لەخەودا ڕزقو ڕۆزی حەلاڵە بە ئەندازەی بینراوو خوراو، ئەگەر ببینێ لە ماڵەکەیدا کیسەیەك بەڕووی هەبێ بەو ئەندازەیە سەروەتو سامانی حەلاڵی دەبێت. وە ئەگەر بەڕو لە ماڵی خەلکیدابێت ئەوا خەلکی ئەمانەت گەلێك لە لای ئەو دادەنێن.

**بەهار :** بینینی بەهار لەخەوداو لە وەرزی بەهاردا. پاشاییە. وە ئەگەر ببینێ وەرزی بەهارە بەلام هەوا ناهەموارەو خەلکی لە دەست گەرما یان سەرما هەراسانن بۆ خەلکی ئەو سەر زەمینە لە لایەن پاشاوە ئازارو گەزەندەیان پێ دەگات. وە ئەگەر ببینێ هەوا سازگاربو وە هەموو جێگەیەك پڕ بوو لە گوڵو گوڵزار ئەوا خەلکی ئەو جێگەیە شادمان دەبنو لە لایەن پاشاوە خێرو بەرەکەتو قازانجیان پێ دەگات. وە ئەگەر بەهاری لەکاتی خۆیدا بە سازگاری ببینێ بەلگەی. سەرفرازییە وە لە لایەن پاشاوە یارمەتی بە خەلکی ئەو جێیە دەگاتو بەلگەی دادپەروەری ئەو پادشایەیە. مانای وەرزی پایزیش هەر بەهەمان شێوەیە.

**بەهەشت :** بینینی بەهەشت لەخەودا شایەتی شادمانیو مژدەی خوای گەورەیە. ئەگەر ببینێ لە میوەکانی بەهەشتی کردەوە یان کەسێ پێی ببەخشێ بە ئەندازەی ئەوە کە خواردویەتی زانستو

دانایی فێردەبێت وە ڕێگاو ڕێبازی دین فێر دەبێتو بەڵام سودی نابێت وە ئەگەر ببینێ لە بەهەشتدا مایەوە بەڵام ئەویان کردە دەرەوە لە دنیادا ئەو کەسە حەزی لە فەسادو گوناحە، وە ئەگەر ببینێ دەرگای بەهەشت بەڕویدا داخرابوو دایكو باوکی ئەو کەسە لێی نارازین وە ئەگەر تا نزیکی بەهەشت ڕۆشتو گەڕایەوە تا دەمرێت نەخۆش دەبێت بەڵام شیفا پەیدا دەکات وە ئەگەر ببینێ فریشتەکان دەستیان گرتو بۆ بەهەشتیان بردو ئەویش بڕواتو لەژێر درەختی تۆبەدا دانیشت لەدنیاو ڕۆژی کۆتاییدا کامەران دەبێت وە ئەگەر لە بەهەشتدا شیرو خواردنەوەیان پێ نەدا بەڵگەی خراپی ئەو کەسەیە لە دیندا.

**بەرگ شۆرین :** ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی جلو بەرگ شۆری بکات بەڵام پیشەکەی جلو بەرگ شۆرین نەبێت بەڵگەی ئەوەیە لە تاوان و گوناه تۆبە دەکات و بەندایەتی خوای گەورە دەکات. چونکە لێکدانەوەی چڵك غەمە و جلو بەرگ شۆر ئەو چڵکە پاك دەکاتەوە.

**بەمردو بەخشین :** ئەگەر کەسێك لەخەویدا جلو بەرگەکەی خۆی بدات بە مردویەك بەڵگەی ئەوەیە دوچاری خەمو پەژارە دەبێت، ئەگەر ببینێت مردویەك قورئانی پێ بدات بەڵگەی ئەوەیە سەرگەرمی کاری پەرستن ئەبێت، ئەگەر ببینێ مردویەك جلو بەرگەکەی بفرۆشێت بەڵگەی ئەوەیە ئەو جۆرە جلو بەرگە گران ئەبێت.

بەراز : لێکدانەوەی بەراز لە خەودا پیاوێکی بەهێز و پارەدارە بەلآم پڕو پوچ و بێ خێرە. وە بەرازی ماڵی پیاوێکی ئازایە بەلآم بێ دینە. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کۆمەڵێك بەرازی لە جێیەکدا بەخێودەکردو بەرەڵایان ناکات کە بڵاو ببنەوە ئەوا سەروەت و سامانێکی زۆر لە ڕێگای حەرامەوە کۆ دەکاتەوە.

بەربونەوە (کەوتنە خوارەوە، هاتنە خوارەوە) : ئەگەر کەسێك لەخەویدا لە بانێك یان کێوێك بکەوێتە خوارەوە ئەوا لە پلەوپایەو سەروەتی کەم دەبێتەوە. ئەگەر ببینێ لەبەرزییەوە بێتە خوارەوە ئەوا بە ئەندازەی ئەو بەرزییە لەسەروەتی کەم دەبێتەوە، ئەگەر ببینێ لە پلەکانەی گڵی یان خشتی بێتە خوارەوە ئەوا لە دینەکەی فەسادو گوناح پەیدا دەبێت، ئەگەر لە پلەکانەی بەرد یان گەچ بێتە خوارەوە ئەوا لەکاری دیندا ڕیاکارو دوڕو دەبێت.

بەردە قانی (قۆچەقانی) : ئەگەر کەسێ لەخەویدا بە بەردەقانی بەردی هاویشت بۆ کەسێك بەڵگەی ئەوەیە ئەو کەسە ڕسوا دەکات وە بەگشتی بینینی بەردەقانی لەخەودا قسەی ناخۆش‌و ناپەسەندە.

برنج : ئەگەر لەخەودا برنج ببینێ، بە ئەندازەی ئەو برنجە سامان بە نارەحەتی بەدەست دێنێ.

برژاندن : بینەری برژاندن لەخەودا خاوەنی قسەیە، وە لە سەردەمی فراوانی‌و پێشکەوتندا، داواکردنی ڕزق‌و ڕۆزییە وە بینینی گۆشتی کولاو چاکترە لە گۆشتی کاڵ.

**بت** : ئەگەر لەخەودا ببینێ کە بت ئەپەرستێ لەگەڵ خوای گەورەدا درۆ دەکاتو بۆ ڕێگای پڕوپوچ دەڕوات وە ئەگەر ببینێ بتی تەختەیی بپەرستێ لە دیندا دوو ڕووە، وە ئەگەر ببینێ ئەو بتە زیوبێ نزیك دەبێتەوە لەو ژنەی کە بە هۆی هەواو هەوەسەوە حەزی لێ دەکات، وە ئەگەر بتەکە ئاڵتون بێت کۆکردنەوەی سامانە بە ڕێگای نایاسایی، وە ئەگەر لە ئاسن یان مس بێت مەبەستی لە دیندا بەدەستهێنانی پلەو پایەو سودەکانی دنیایە.

**بیناکاری** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی تەلار یان خوێندنگا یان خانەقا دروست دەکات بەڵگەی ئەوەیە کەبەدوای دینداریدا دەگەڕێت و چاوەڕێی پاداشتی ڕۆژی کۆتای دەکات، ئەگەر لە زەویەکی خراپ و بایەخدار تەلار یان دوکانو هاوشێوەکانی دروست بکات بەڵگەی ئەوەیە سودو قازانجی دەست دەکەوێت

**برۆ** : مانای برۆ لەخەودا دینە وە ئەگەر برۆکانی بەتەواوی‌و بەبێ کەمو کوڕی بینی جوانی‌و ئاراستەی دینی پێگەیشتوو تەواوە وە ئەگەر ببینێ برۆکانی بڕوتێتەوە ماناکەی پێچەوانەی ئەوەیە.

**بوك** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بوکی بۆ بێت بەڵام نەیبینی و ناوەکەی نەزانێت بەڵگەی ئەوەیە مردنی نزیك بوەتەوە، وەئەگەر بینی بوکەکە و هاتە ماڵەکەیەوە و لەگەڵیدا خەوت بەڵگەی ئەوەیە بە پلەو پایە دەگات.

**بیابان** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بیابانی بینی بەئەندازەی ئەو بیابانەوە لەلایەن پاشاوە سودو قازانجی دەست دەکەوێت، ئەگەر بینی لە بیابانێکی فراوان و سەرسەوزدا بێت ئەوا دەبێتە کەسە

نزیکەکانی پاشا وەئەگەر بیابانەکە پڕ لە درك بوو ئەوا لەگەڵ پاشایەکی زۆردار و ستەم کاردا دانیشتن و چاو پێکەوتن دەکات.

بڕبەن : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بڕبەنێکەبوو وە بەو بڕبەنە ژەنگە ئاسنی پاك کردەوە ئەوا لەکارەکانیدا بەرەو پێش دەڕوات.

بۆیاخ کردن ( رەنگ - خەنە ) : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بە شتانێك بۆیاخ بکات ئەوا خەڵکی پەسەندی ناکەن و دەست بەکاری بێهودە و ناپەسەند دەکات. ئەگەر ببینێ بۆیاخەکەی جوان رەنگ بگرێت ئەوا حاڵ و وەزعی پەنهان دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەست و قاچی بە خەنە رەنگ بکات ئەو سەروەتەی لەدەستی چووە دووبارە بەدەستی دەهێنێتەوە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی هەردوو دەست و قاچی رەنگ بکات ئەوا منداڵ و براکانی خۆی بۆ سەر رێگایەك دەبات کە پێچەوانەی دین بێت.

بۆڵ (( هێشو )) : لێکدانەوەی هێشو لە خەودا ئەگەر تازەو سەوزبێت زیاد بونی سەروەت و منداڵە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا هێشوی وشکی بینی بەرگەی هەژاری و قات و قڕیشە و هێشو ی خورما و هێشو ی ترێ ی تازە چاکترە بەتایبەت ئەگەر لە تەمەنی وەرزی خۆیاندا بێت.

بۆق : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بۆقی هەیە لەگەڵ کەسێکی دیندار و پارسادا چاوپێکەوتن و دانیشتنی دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بۆق بکوژێت و گۆشتەکەی بخوات پیاوچاکێك دەبەزێنێ وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ژمارەیەکی

زۆر بۆق لە شوێنێکدا کۆبونەوەو لەوشوێنەدا بخوێنن، ئازار و ئەشکەنجەی خواوەند بەسەر ئەو شوێنەدا دادەبارێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بۆقێك لە ئاودا بگرێت و بیخاتە سەر زەوی ئەوا ستەم لە پیاوێکی پاك و خواناس دەکات.

بۆقلێدان : بۆق ئەو ئامێرەیە کە سەردەمانی کۆن بە شاخی ئاژەڵەکان بۆقیان پێ لێ دەدا وە یان ئەو ئامێرەی کە هاواری پێ دەکرا) ئەگەر کەسێ لە خەویدا بۆقی لێدا مانای ئەوەیە کە خەڵکی لە ڕازو نهێنییەکانی خۆی ئاگادار دەکات، وە ئەگەر ببینێ بۆق لێدەدات لە نێوان خەڵکانێکی گرنگو ناوداردا درۆیەکی گەورە دەکات بە سوێند خواردنی درۆینە درۆکەی دەباتە سەرو لە پاشدا ئاشکرا دەبێت کە قسەکەی درۆ بووە.

بیابان : ئەگەر کەسێ ببینێ لە بیابان هاتەوە لەخەمو پەژارە ڕزگاری دەبێت وە ئەگەر بۆ بیابان بڕوات غەمگینو دەردەدار دەبێت.

بێژنگ : لێکدانەوەی بێژنگ لە خەودا خزمەتکارێکی پاك و خاوێنە، ئەگەر ببینێ بێژەنگی تازەی هەبێت ئەوا ڕەنجبەر یان کەنیزەکێکی پاك و خاوێن پەیدا دەکات. ئەگەر بێژەنگەکە وون بووبێت یان لەناو بچێت ئەوا خزمەتکارەکەی لێی جیادەبێتەوە.

برژانگ : ئەگەر کەسێ لەخەویدا برژانگەکانی هەڵوەرێت بەڵگەی ئەوەیە دینو ئاینی خراپە، ئەگەر ببینێ برژانگەکانی هەڵبکێشێت بەڵگەی ئەوەیە نەخۆش دەکەوێت، ئەگەر برژۆڵەکانی لەجێی خۆی ببینێ بەڵگەی ئەوەیە پارێزگاری لەدینەکەی دەکات.

**بروسکە** : (( چەخماخە )) ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی هەور ئاگری چەخماخە بۆ زەوی فڕێ بدات ئەوا بەقەدەر ئەو چەخماخەیە ئازارو ئەشکەنجە و گرفتاری بۆ خەلکی ئەو شوێنە دێتە خوار.

**بزمار** : لێکدانەوەی بزمار لەخەودا کەسێکی یارمەتی دەرە. ئەگەر ببینێ بەهۆی بزمارەوە شتێك بەشتێکی ترەوە ببەستێت بەلگەی ئەوەیە کار گەلێ بە میهرەبانییەوە دەکاتو سەروەتو سامان دەبەخشێ، بەلام ئەگەر بزمار وون بکات لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

**بستە** : واتای بستە لەخەودا سەروەتو سامانە وە ئەگەر ببینی ئاوکی بستەت هەبێ لە کەسێکی بەخیلەوە سەروەتو سامان بەدەست دێنی.

**بلبلە (جۆرێکە لە سوراحی مسی کە پێشینان بەکاریان دەهێنا)** : بلبلە لە خەودا ژنە، ئەگەر ببینی بلبلە دەکڕیت یان کەسێ پێی دایت کەنیزە دەکڕیت یان ژن دەهێنی. ئەگەر ببینی لە بلبلەکەدا ئاوت خواردەوە لەگەڵ ژنێکدا جوت دەبیت. ئەگەر ببینی بلبلەکەت شکا کەنیزەکەت یان ژنەکەت دەمرێت. ئەبوخەلدە دەڵێ : لەلای ئیبن سیرین بووم، پیاوێك هاتو وتی خەوم بینیوە لە بلبلەدا ئاوم دەخواردەوە وە ئەو بلبلەیە دوو لێوی پێوە بوو لە لێوێکیان ئاوێکی شیرینو خۆش تامو لەو لێوەکەی تر ئاوێکی سوێرو تاڵم دەخواردەوە! ئیبن سیرین وەلامی دایەوە : تۆ ژنێكو ژن خوشکێکت هەیە لەگەڵ هەردوکیاندا جوت دەبیت، تۆبە بکەو لەخوا بترسە.

پیاوەکە ووتی: هەمان شێوەیە کە دەڵێی ئێستا تۆبە دەکەمو دەگەڕێمەوە بۆلای خودا.

**بومەلەرزە :** ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بومەلەرزە بێت ئەوا خەڵکی ئەو سەرزەمینە دوچاری بەلا دەبن و لەوانەشە دوچاری نەخۆشی ببن. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زەوی سەرەو ژێر ببێت ئەوا خەڵکی ئەو شوێنە دوچاری فیتنە و بەلایەکی گەورە دەبن.

**بریندار بوون :** ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کەسێك لەشی بریندار بکات و خوێنی لێ نەیەت بەڵگەی ئەوەیە ئەوکەسە قسەیەکی راستی پێ دەڵێت و ئەویش ناتوانێ وەلامی بداتەوە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەبرینەکەی خوێنی لێ بێت ئەوا ئەوکەسە قسەی درۆ و ناشیرینی پێ دەڵێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بەلەشی خۆیەوە برینی زۆری بینی ئەوا لە سەروەتی کەم دەبێتەوە یان تۆبە لە گوناهەکانی دەکات.

**بلور :** بینینی بلور لەخەودا ژنی بێ ئەسڵو نەسەبە. ئەگەر ببینی بلورت هەبێ یان کەسێ پێت بدات مانای ئەوەیە ژنی بێ ئەسڵو نەسەبت پێ دەدرێت وە ئەگەر ببینی بلورت هەبو وونت کرد ژن تەلاق دەدەیت یان لێت دوور دەکەوێتەوە، ئەگەر ببینی ئەندازەیەکی زۆر بلورت هەبو بە هۆی ژنانەوە سەرمایەیەکی زۆرت دەست دەکەوێت.

**بتڵی شوشه** : بینینی بتڵی شوشه لەخەودا پەرتەوازدییە لە ماڵو سامانێکدا کە پێیان سپاردووە. ئەگەر لە بتڵەکەدا شتێکی سەرخۆشکەری بینی ماناى ئەودیە کە حەرام خۆر دەبێ.

**برین** : (( زام )) : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی برین بە لەشیەوە بوو بەلاَم خوێنی لێ نەیەت ئەوا بەسەر ئەوکەسەدا زاڵ دەبێت کە خەمباری کردووە و هەروەها خێرو قازانجیش دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە برینەکە خوێن بێت و لەشی خوێناوی بکات ئەوا سەروەتی حەرام بەدەست دێنێ.

**بێڵ** : (خاکەناس) : واتای بێڵ لەخەودا خزمەتکارێکە کە کارەکان بە باشی ئەنجام دەدات.

**بولبول** : کرمانی دەڵێ : لێکدانەوەی بولبول لە خەودا منداڵی بچوکە وە ئاوازی بولبول لە خەودا قسەی خۆش و خەندە دەرە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بولبولەکەی بەربێ منداڵەکەی ون دەبێ. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بولبول بەدەستیەوە بمرێ ئەوا منداڵەکەی دەمرێت.

**بۆنی خۆش** : بۆنی خۆشو ناخۆش لەخەودا بەچاك باسکردنو سوپاس کردنو قسەی ناشیرینو ناپەسەندە وە ئەگەر ببینێ بۆنێکی خۆشی کرد واتای ئەوەیە سەرزەنشت دەکرێت. وە ئەگەر بۆنێکی زۆر خۆشی بەر لوت کەوت واتاکەی مردنە.

**برسێتی** : لێکدانەوەی برسێتی لەخەودا چاکترە لە تێری یان تێری چاکترە لەتینوێتی، ئەگەر لەخەودا برسی بێتو خواردن بخوات ئەوا تەماع پەیدا دەکات.

## پیتی ( پ )

**پاش ئاخوڕ** : لێکدانەوەی پاش ئاخوڕی ئەسپو گاو مانگا لەخەودا سەروەتو سامانە بە تایبەت ئەگەر کەسێ ببینێ پاش ئاخوڕی زۆری هەبێت ئەوا سەروەتو سامانی زۆر بەدەست دێنێ، پاش خوانی مرۆڤ بەلگەی سامانی حەرامە، ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ پاش خوانی خۆی بەخۆڵ داپۆشێ ئەوا سەروەتو سامانی خۆی لەزەویدا دەشارێتەوە.

**پاژنەپێ** : واتای بینینی پاژنەپێ لەخەودا ڕێكوپێککردنی کارو کاسبی خەڵکییە، ئەگەر ببینێ پاژنەی پێی بشکێ سەرگەرمی کارێك دەبێت کە لێی پەشیمانە وە ئەگەر ببینێ پاژنەی پێی بقلێشێ وە یان بریندار ببێت واتاکەی هەرهەمان شێوەی دەبێ بەڵام پەشیمانییەکەی کەمتر دەبێت.

**پادشا** : دوانزە شت بۆ بینەری خەو دەبنە هۆکاری بە پادشابونی ئەو کەسە: ١) یەکەم ببینێ پێغەمبەر (ص) بیکاتە ڕابەرو پێشەوا ٢)ببینێ زانستو دینو شەریعەت بەرەو پێش ببات ٣) ببینێ لە پێش پێغەمبەردوە چاوەڕێی نوێژبێت ٤)ببینێ لە مینبەری پێغەمبەردا (ص) وتار بڵێ ٥)ببینێ جلوبەرگی پێغەمبەر لەبەربکات ٦)ببینێ مستیلە یان ئەڵقەی لە پەنجەدابێت ٧)ببینێ کە بوبێت بە خۆر یان مانگ ٨)ببینێ لەشی وەك ڕوباری لێ بێت ٩) ببینێ چاوی بوبێت بە دیواری شار ١٠)ببینێ چاوی بوبێت بە میحرابی مزگەوت

١١)ببینێ پاشایەك مستیلەیەکی پێ بدات ١٢)ببینێ چاوی وەك گای لێ بێت.

**پارو** : ئەگەر کەسێك لەخەویدا پارویەکی شیرینی لە دەمدا بێت بەلگەی ئەوەیە قسەیەکی جوان‌و خۆش دەکات بەلام ئەگەر پاروەکە ترش بێت لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

**پاسار** : لەخەودا لێکدانەوەی پاسار پاشای زەلیل و ناپەسەندە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەژێر پاساردا دانیشتبێت ئەوا دەبێتە خزمەتکارێکی پاشایەکی لەوجۆرە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی پاسار بەسەریدا بکەوێت یان بڕوخێت و ئازاری پێگەیاند ئەوا پاشا لێی بەقین دەبێت و ئازار و ئەشکەنجەی ئەدات.

**پاس کردن** : واتای بینینی پاسکردن لەخەودا دو لایەنی هەیە ئەگەر ببینێ لەخەویدا پاسەوانی لە کەسانی چاك بکات سودی دنیاو ڕۆژی کۆتایی دەبات وە ئەگەر ببینێ لە کۆشکی پاشایدا پارێزگاری لە پادشا بکات سودو قازانجی دەست دەکەوێت. وە ئەگەر بازرگانێ ئەم خەوە بیبینێ لە بازرگانیدا سودێکی کەم وێنەی دەست دەکەوێت.

**پاسەوان** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەگەڵ پاسەواندا بگەڕێت وە ئەو پاسەوانانە کەسانێکی رێك و پێك بوون ئەوا قازانجی پێدەگات وە ئەگەر پاسەوانەکان فەساد و نادروست بوون ئەوا دووچاری زیان دەبێت.

**پاوانە** : پاوانە لەخەودا بینینی قسەیەکی خۆشە یان ماچ کردنی منداڵە یان خێزان‌و هاوڕێ. وە ئەگەر پاوانەی گەورەی بینی نیعمەت‌و ڕزق‌و ڕۆزی حەلاڵە بەو ئەندازەیەی کە بینیویەتی. وە

ئەگەر ببینێ پیرژنێك خەرمانێك پاوانەی پێ ببەخشێ بەو ئەندازەیە سەروەت‌و سامان بەدەست دێنێت وە ئەگەر بینی پاوانەی زۆری هەبێت‌و بیدات بە خەلکی یان وونی بکات ئەگەر ماڵ‌و سامانی هەبێت هەمووی خەرج دەکات وە یان وونی دەکات وە لە دەستی دەردەچێت.

**پالآن (کۆپان)** : بینینی پالآن لەخەودا ژنە، ئەگەر ببینێ پالآنی هەیە وە یان پالآن لە کەسێك وەربگرێت ژن ئەهێنێ یان کەنیزەکێك دەکرێت وە ئەگەر ببینێ پالآنی بە پشتەوە بێت فەرمانبەرو گوێرایەڵی ژن دەبێت‌و ژنەکە بەسەریدا زاڵ دەبێت وە ئەگەر ببینێ پالآنی وون کرد ژنەکەی لێی جیا دەبێتەوەو تەلآقی دەدات.

**پاقلە** : خواردنی پاقلە لەخەودا چ لە کاتی خۆیدا و چ بە کۆلآوی یان بەکاڵی، غەم‌و پەژارەیە. وە مانای تەڕو ووشك‌و کۆنەشی یەکسانییە، وەئەگەر ببینێ کە پاقلە نەخۆی پەژارەو خەمت کەمتر دەبێت.

**پاقلاوە** : ئەگەر کەسێ ببینێ پاقلاوە بخوات کە لە بادام‌و شەکر دروست کرابێت سامانی زۆر بەدەست دێنێت وە ئەگەر پاقلاوەی نارگیل‌و شیر بخوات سودو قازانجی کەمتر دەبێت.

**پاڕانەوە** : لەخەودا لێکدانەوەی پاڕانەوە بەلگەی دەستەبەرکردنی پێداویستیەکانە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بۆ خۆی بپاڕێتەوە بەلگەی ئەوەیە عاقیبەت خێر دەبێت وە ئارەزووەکانی دێتە دی. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بۆ کەسێك

بپارێتەوە بەڵگەی ئەوەیە دووچاری ستەم و فەساد دەبێت و فەرمان بە چاکە ناکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ستەم لێکراوێك بپارێتەوە ئەوە خێرخوازی هەموو خەڵکیەو پێداویستیەکانی هەوان بەراورد دەکات وە ئەگەر بینی پارانەوەدیەکی تایبەت بکات ئەوا منداڵی دەبێت.

**پارە دروستکەر :** ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی پارە دروست بکات بەڵگەی ئەوەیە کە وتارو جوڵەی خۆی ئاراستە دەکات و بە لوت بەرزی و لە خۆباییەوە بۆ خەڵکی باس دەکات.

**پاچە (سەروپێ) :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ سەروپێی مەڕ بخوات بەو ئەندازەیە سەوەتو سامانی دەست دەکەوێت وە ئەگەر بینی سەروپێی گا بخوات بەو ئەندازەیە سەروەت بەدەست دێنێو فراوانیو پێشکەوتن لە کارەکانیدا دەبینێت.

**پەیژە :** ئەگەرکەسێك لەخەوی دا ببینێ سەربکەوێت بەسەر پەیژەی خشتی یان گڵی دا بەڵگەی ئەوەیە کاروبارەکانی بەچاکی بەڕێوەدەڕوات بەڵام ئەگەرپەیژەکەلەجۆری دار بێت بەڵگەی ئەوەیە دینەکەی سست ولاوازە ، وەئەگەرپەیژەکە لەجۆری بەرد یان ئاسن بێت بەڵگی ئەوەیە بەهێزدەبێت .

**پەڕ :** ئەگەر کەسێ ببینێ وەکو باڵندە پەڕی هەبێت بە ئەندازەی ئەو پەڕانە گەورەییو سەروەری دەست دەکەوێت هەندێك لەخەو ناسان دەڵێن بینینی پەڕ لەخەودا، هێزو توانایە.

**پەری :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا پەرییەکی شادو جوانی بینی سەرفرازو سەروەت بەند دەبێت. وە ئەگەر پەری ناشیرینو غەمگینی

بینی دوچاری غەمو پەژارە دەبێت، ئەگەر پەری خۆش ڕوو بە مردوویی ببینێ لە کاروبارەکانیدا پەرێشان دەبێت وە ئەگەر ببینێ لەگەڵ پەریدا شەریکات کارەکانی ئاڵۆز دەبنو بێ سامان دەبێت.

پەردە : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ پەردەیەکی ناسك یان ئەستور بەدەرگای ماڵەکەیدا هەڵبواسرێت پەژارەو غەمو ترسو لەرز دێنێ.

پەرشە : ئەگەر کەسێ لەخەویدا پەڕشە بخوات، ئەوا بەو ئەندازەیە دوچاری غەمو پەژارە دەبێت، ئەگەر پەڕشە بدات بەکەسێ وەیان پێی بفرۆشێت بەڵگەی ئەوەیە غەمو پەژارە دەدات بەو کەسە.

پەلکە : بینینی پەلکە لەخەودا بۆ کەسانی گەورەو خانمان بەڵگەی عیزەتو پایەدارییە، بۆ کەسانی دەوڵەمەند بەڵگەی سەروەتە، بۆ کەسانی دەروێشو صوّفی بەڵگەی خۆشەویستییە بۆ بنەماڵەکەی پێغەمبەر (د.خ)

پەشتە ماڵ : ئەگەر کەسێ لەخەویدا پەشتە ماڵی هەبێت بەڵگەی ئەوەیە شادیو کامەرانی بەدەست دێنێت بەڵام ئەگەر پەشتە ماڵەکە کۆنە بێت ئەوا لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

پەموو : واتای پەموو لەخەودا ماڵی دنیایە.

پەنجەکان : مانای بینینی پێنج پەنجەکانی دەستی ڕاست نوێژەکانی پێنج فەرزە، پێنج پەنجەی دەستی چەپ برازاکانەو هەندێکیش گوتویانە پەنجە گەورە نوێژی بەیانیانە پەنجەی ئاماژە نوێژی نیوەڕۆیەو پەنجەی ناوەڕاست نوێژی عەسرەو پەنجەی براتوتە نوێژی مەغریبەو پەنجە بچکۆلە (توتە) نوێژی خەوتنانەو

چاکیو ڕێکوپێکی نوێژەکانە. وە ئەگەر ببینێ پەنجەی دەستی ڕاستی نەبێ منداڵ یان براکەی دەمرێت وە هەندێك وتویانە کوڕەکەی یان براکەی توشی بەلایەك دەبێت.

**پەنیر** : ئەگەر کەسێ پەنیری ووشك ببینێ لەسەفەردا ماڵو سامانی کەمی دەست دەکەوێت. وە ئەگەر پەنیری تەڕی بینی سەروەتو سامانی زۆری لە وڵاتەکەیدا دەست دەکەوێت.

**پەیکەر** : بینینی پەیکەر لەخەودا ژنە ئەگەر ببینێ پەیکەرێکی هەبێت ژن دەهێنێ وە ئەگەر ببینێ پەیکەرێك لە کەسێك بکڕێت کەنیزەکێکی تەمەن منداڵ دەکڕێت وە ئەگەر پەیکەرێکی هەبێتو وونی بکات یان لە دەستی کەوتە خوارێو بشکێ ژنەکەی تەلاق دەدات یان ژنەکەی دەمرێت وە یان پەیکەرەکەی خۆی بەشێوەیەکی تر ببینێ گوزەرانی دەشێوێ.

**پەڕەسێلکە** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی پەڕەسێلکەی ببێ وە یان کەسێك پێی بدات لەگەڵ ئەوکەسەی کە ناکۆك بوە ئاشتی دەبێتەوە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی پەڕەسێلکە بکوژێت ومیان لەدەستی بەربێت لەگەڵ هاوڕێیەکیدا کە هەمیشە پێکەوەن جیا دەبێتەوە و دوردەکەوێتەوە.

**پەپولە** : لەخەودا لێکدانەوەی پەپولە پیاوی لاواز و نەزانە کە بە نەزانی خۆی دەخاتە مەترسیەوە.

**پێستەچی** : لەخەودا لێکدانەوەی پێستەچی ئەنجامدانی کاری خراپەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی پێستەچێتی بکات ئەوا کاری خەڵکی بە ڕێکو پێکی ئەنجام دەدات.

**پەرستن :** ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خوای گەورە بپەرستێ ئەوا کاری چاکە و دروست ئەنجام دەدات، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بۆ شتێکی تر بێجگە لە خوا کڕنوش بەرێت ئەوا لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە مزگەوت یان شوێنێکی پاکدا بەندایەتی بکات ئەوا کاری خێری زۆر ئەنجام دەدات وە ئەگەر لە شوێنێکی ناپەسەندا بەندایەتی بکات لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

**پەلکە زێڕینە :** ئەگەر پەلکە زێڕینە لەئاسماندا زەردیەکەی زیاتر بێت ئەوا خەڵکی ئەو سەرزەویە نەخۆش دەکەون. وە ئەگەر زۆرتر مەیلەو سەوز بوو ئەو نیعمەت و بژێوی ئەو سەرزەمینە زیاتر دەبێت وە ئەگەر سوریەکەی زۆرتر بوو لێکدانەوەکەی پێچەوانەی ئەوەیە.

**پەت ( گوریس ) :** لەخەودا لێکدانەوەی گوریس پەیمان و بەڵێنە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چنگی لەپەتێك گیرکردبێ و خۆی پیا هەڵواسیبێت ئەوا بەئەندازەی بەرزی پەتەکە پلەو پایە بەدەست دێنێ. ئەگەر بینی پەتەکە بپچڕێ و کەمێکی بەدەستەوە بمێنێتەوە ئەوا لەو پلەو پایە و سەربەرزیە دەکەوێت.

**پرد دروستکردن :** واتای پرد لەخەودا پاشایە یان کەسێکە کە خەڵکی بە هۆی ئەوەوە بەمەبەست دەگەن.

**پشت :** پشت لەخەودا پیاوێکە کە بینەری خەوەکە داوای یارمەتیو هێزو ووزەی لێ دەکات. ئەگەر کەسێ ببینی پشتی بشکێت

کەسێك کە پشتو پەنایەتی دەمرێت، وە ئەگەر ببینێ پشتی بریندارە بەو کەسەی کە پشتیوانیەتی ئازارو ئەشکەنجەیەك دەگات.

**پلە گۆشت :** لێکدانەوەی پلەگۆشتی کولاَو باشترە لە نەکولاَو وە هەر چەند تام خۆشتربێت سودو قازانجی زۆرتر دەبێت، ئەگەر ببینێ لە گۆشتی گای قەڵەو پلو قیمە بخوات ئەوا لەو ساڵەدا پارێزراو دەبێت، ئەگەر لە گۆشتی بزن پل بخوات سودی کەمتر دەبێت، ئەگەر ببینێ لە گۆشتی ئەسپ پل بخوات ئەوا لە لایەن پاشاوە سودو قازانجی پێ دەگات، ئەگەر ببینێ لە گۆشتی ماسی بخوات ئەوا لەسەفەردا سەروەت بەدەست دێنێ وە ئەگەر پلە گۆشتی حوشتربێت ئەوا لە کەسێکی گەورەو بەرێزەوە سودی پێدەگات.

**پلوسك :** ئەگەرکەسێ لەخەودا ببینێ ئاولەپلوسك بێتەخوارەوە بەڵگەی ئەوەیە لەوشوێنەدا خوێن رێژی بەرپادەبێت، ئەگەرببینێ باران ببارێ و لەپلوسکەوە بێتەخوارەوە بەڵگەی ئەوەیە لەلایەن پاشای ئەوشوێنەوە زەرەروزیان بەخەڵکی ئەوشوێنە دەگات، ئەگەرببینێ بەبێ هەورباران ببارێ و لەپلوسك سەر رێژبکات بەڵگەی ئەوەیە پەروەردگار رەحمەت بەسەرخەڵکی ئەوشوێنەدا دەبارێنێ، ئەگەرببینێ لەپشتی بانەکەی خۆیدا پلوسك دابنێ بەڵگەی ئەوەیە لەلایەن کەسێکی گەورەوە قازانجی پێ دەگات، ئەگەر ببینێ پلوسك بکەوێتە خوارەوە بەڵگەی ئەوەیەزەرەروزیان دەبینێ.

**پشتەمل :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ شەپازلەیەك لەپشت ملی بدەن وە جێگەکەی وەرمی کرد، لەو کەسەوە کە چەپازلەکەی لێ دەدات سودو قازانجی پێ دەگات، وە ئەگەر ببینێ پشت ملی مویەکی

زۆری پێوە بێت، قەرزدار دەبێت وە ئەگەر ببینێ مووی پشتەملی بتاشێت قەرزەکانی دەداتەوە.

**پشیلە** : پشیلە لە خەودا پیاوی دز و فاسد و بەدکارە. ئەگەر بینی پشیلە هاتە ماڵەکەیەوە ئەوا دزێك دێت بۆ ماڵەکەی. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی پشیلە شتێکی لە ماڵەکەی خوارد ئەوا دز شتێك لە ماڵەکەی دەدزێت. وە ئەگەر بینی پشیلەکە دەکوژێت ئەوا دزەکە دەکوژێت وە یان دەست گیری دەکات.

**پشیلەی بیابانی** : لێکدانەوەی پشیلەی بیابانی لە خەودا بەڵگەی سەروەت و سامانە، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەگەڵ پشیلەیەکی بیابانیدا شەڕ بکات لەگەڵ کەسێکی غەریبەدا شەڕ دەکات. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی پشیلەی بیابانی بکوژێت و پێستەکەی لێ بکاتەوە سەروەت و سامانی کەسێکی غەریب تالآن دەکات.

**پیاو** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا پیاوێکی ئاشنای بینی بەڵگەی ئەوەیە پیاوێکی ئاشنا دەبینێ بەلآم ئەگەر پیاوێکی نەناسراو ببینێ بەڵگەی ڕقو کینەیە.

**پیاز** : کرمانی دەڵێت : پیاز لەخەودا، ماڵی حەرامو قسەی ناپەسەندو ناسیرینە، ئەگەر بینەری خەوەکە پیاوێکی ڕەفتار چاك بوو بە کۆششی خۆی لە خواردنی ماڵی حەرام خۆی دور دەخاتەوە وە ئەگەر ڕەفتار چاك نەبوو ماڵی حەرام کۆدەکاتەوەو خەڵکی بەردەوام باسی بە خراپە دەکەن، بە تایبەت ئەگەر پیازی سوری بینی، ئەگەر

پاککراوی بینی سەرئەنجام لەخواردنی ماڵی حەرام دور دەکەوێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆلای خودا.

**پیاڵە** : بینینی پیاڵە لەخەودا کەنیزەکێکە کە لە گەڵیدا خۆشگوزەران دەبیت ئەگەر ببینی لە پیاڵەدا ئاو یان گوڵاو بخۆیتەوە ئەوەیە لەگەڵ کەنیزەکێکدا بە شێوەیەکی حەڵاڵ جوت دەبیت وە لە گەڵیدا دەبیتە خاوەنی منداڵێکی ساڵح وە ئەگەر بینی لەو پیاڵەدا ئاو یان گوڵاو ڕژا بەڵگەی ئەوەیە کە منداڵەکەی دەمرێت.

**پیسی (پاشەڕۆ)** : بینینی پیسی لەخەودا سەروەتو سامانە ئەگەر کەسێ ببینێ لەشی بە پیسی پیس بوبێ بە ئەندازەی ئەو پیسیە سەروەتو سامان بەدەست دێنێ.

**پیرەژن** : بینینی پیرەژن لەخەودا ئەگەر کافربێت سەروەتو سامانی حەرامە، ئەگەر پیرەژنەکە موسڵمان بێت سەروەتو سامانی حەڵاڵە، ئەگەر ببینێ لەگەڵ پیرەژنێکدا جوت ببێت بە ئارەزووەکانی دنیایی خۆی دەگات.

**پیربون** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا پیر ببێو ڕیشی سپی بێت پلەو پایەدار دەبێت وە ئەگەر پیرێکی نەناسراو ببینی کەسەرحاڵو شادبێت بەهۆی دۆستێکتەوە بە ئارەزووەکانت دەگەیتو لەغەم بەدور دەبیت وە ئەگەر پیرێکی ناسراوت بینی لەو پیاوەوە شتێکت بەدەست دەگا وە ئەگەر پیرەکە غەمگین بوو واتاکەی پێچەوانەی ئەوەیە.

**پیو خواردن** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ پیو بخوات. فراوانیو سود لە کارەکانیدا پەیدا دەکات وە ئەگەر ببینێ کە پیوی مەڕ بخوات بە ئەندازەی ئەو پیوە ماڵی حەڵاڵ بەدەست دێنێ وە

ئەگەر ببینێ پیوی ئاژەڵێك بخوات كە ئەو ئاژەڵە حەڵاڵ بێت سەروەتی حەڵاڵ بەدەست دێنێت.

**پێڵاو** : لێكدانەوەی پێڵاو لەخەودا ژنە. ئەگەر پێڵاوی تازەی لەپێدا بێت ژن دەهێنێ، ئەگەر پێڵاوەكانی ڕەش بێت ئەو ژنە ژنێكی دەوڵەمەند دەبێت وە ئەگەر پێڵاوەكان سەوزبێت ئەوا ژنەكە ژنێكی چاكو خێرخواز دەبێت، ئەگەر پێڵاوەكان سوربێت ژنێكی داوێن پاكو هاودەم دەبێت بەڵام ئەگەر پێڵاوەكان زەردبێت ئەوا ئەو ژنە ژنێكی نەخۆش دەبێت.

**پێوانە** : بینینی پێوانە لەخەودا ڕێكو پێكیو دادو ویژدانە لەگەڵ خەڵكی بە تایبەت ئەگەر پێوانەكە ڕاستو دروست بێت. ئەگەر پێوانەی دەست كەوت یان كەسێك پێی بدات مامەڵەی دروستو بە ویژدان ڕەچاو دەكات وە لە كڕینو فرۆشتندا بەرێكوپێكی هەڵسو كەوت دەكات وە ئەگەر ببینێ پێوانەكەی بشكێ ئەگەری مردنی خاوەنەكەی دەردەخات وە ئەگەر ببینێ بە پێوانە شتێك ئەندازەگیری بكات ئەگەر خوازیاری زانست بێت دەبێتە قازی وە ئەگەر لایەنگری زانست نەبێت بۆ قەزاوەت كردنو داوەری لە بابەتێكدا پێویستی بە قازی یەك دەبێت.

**پێش نوێژی** : ئەگەر كەسێ لەخەویدا پێش نوێژی كرد بێ ئەوەی لەوەو پێش پێش نوێژی كردبێ. دەبێتە پێشەواو ڕابەری ئەو خەڵكە وە هەموان دەبنە لایەنگری ئەو ئەگەر ببینێ بە دانیشتویی پێش نوێژی بكات نەخۆش دەكەوێت. وە ئەگەر بە پاڵەوە پێش نوێژی كرد بەزویی دەمرێت وە ئەو خەڵكە نوێژی بۆ دەكەن وە

ئەگەر پێش نوێژی کۆمەڵەیەکی بینی بە ئەندازەی گەورەیی ئەو پێش نوێژە شەرەفو پلەوپایە پەیدا دەکات وە ئەگەر ببینێ بە پێش نوێژی حکومەت فەرمان ڕەوایی بدات یان لەگەڵ پێش نوێژێکدا چونەماڵێك یان پێش نوێژێ شتێکی پێ ببەخشێت یان لەگەڵ پێش نوێژێکدا نانی خوارد بەو ئەندازەیە غەمو پەژارەی پێ دەدرێت.

**پڵنگ** : پڵنگ لەخەودا دوژمنێکی بەهێزە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەگەڵ پڵنگدا شەڕ دەکات ئەوا لە گەڵ دوژمنەکەیدا شەڕ دەکات. وە ئەگەر پڵنگ بەسەریدا زاڵ بوو ئەوا دوژمن بەسەریدا زاڵ دەبێت. وە ئەگەر ئەو بەسەر پڵنگەکەدا زاڵ بوو ئەوا ئەو بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی گۆشتی پڵنگی خوارد ئەوا دووچاری شەڕ دەبێتەوە بەڵام سەردەکەوێت و پلەو پایەی زیاد دەبێت.

**پزیشکی چاو** : پزیشکی چاو لە خەودا بەڵگەی کارگەلێك سەخت و ئاڵۆزەو دۆزینەوەی ڕێگە چارەیە کەتێیدا بێ ئاگاو گومڕا هەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بودتە پزیشکی چاو وە دەرمانەکانی ئەو بۆ نەخۆشی سود مەند بوو بەڵگەی ئەودیە ئەو سەرلێشێواوانەی دەچنە لای ڕێگەی ڕاست دەدۆزنەوە و سودی لێ دەبەن وە ئەگەر دەرمانەکانی چاك و کارا نەبوون لێکدانەوەکەی پێچەوانەیە.

**پرژەی ئاگر** : لەخەودا لێکدانەوەی پرزەی ئاگر قسەی ناشیرینە کە بەبینەری خەوەکە دەوترێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا

بینی پرژەی ئاگری زۆری بۆ بێت دووچاری بەڵای سەخت و هەژاری دەبێت.

**پردی سرات :** ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەسەر پردی سیراتدا وەستابێت ئەوا گوناه و خراپەکاریەکان بەدەستی ئەو لائەبرێت.

**پزیشك :** ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی پزیشك نەخۆشێك چارەسەربکات ئەوا ئەوکەسە لەگوناه کردنەوە بانگ هێشت دەکات بۆ رێگای راست و دروست بەڵام ئەگەر نەخۆشیەکەی زیاتربێت لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

**پژمە :** ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی پژمەی کرد و الحمدولله ی کرد بەڵگەی ئەوەیە بەهۆی کەسێکی گەوردوە بە ئارەزوەکانی دەگات وە ئەگەر بینەری خەوەکە کەسێکی نەخۆشی بێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی سێ جار بەسەریەکەوە پژمەی کرد ئەوا شتێکی باشە بەڵام ئەگەر پژمەی زۆری کرد زۆر بەسەختی بە ئارەزودکانی دەگات.

## پیتی ( ت )

**تا** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ هەمیشە تای هەبێتو تاکەی دانەبەزێ بەلگەی ئەوەیە هەمیشەو بەردەوام فەسادو گوناح دەکات پێویستە تۆبە بکات تا لە ڕەنجو نارەحەتی دەربازببێ.

**تاج** : تەعبیری تاج لەخەودا بۆ پاشا حکومەتو دەسەڵاتە بۆ ژنان مێردەو بۆ خەلکی ئاسایی چاکبونی ماڵو گوزەرانی خەلکییە. ئەگەر کەسێ ببینێ تاجی ئالتون لەسەری بێت بە پلەوپایەیەکی بەرز دەگات بەلام لە دیندا لاوازە ئەگەر ژن ئەم خەوە ببینێ هاوسەرەکەی دەبێتە خاوەن دەسەلاتو پاشایەتی.

**تالان** : ئەگەر ببینێ ماڵو نیعمەتی کەسێك بە تالان ببات بینەری خەوەکە بە ئەندازەی ئەوەی تالانی کردووە زیانی لێ دەکەوێتو غەمو پەژارەی بۆ دێت.

**تالانی** : جابر مغربی دەڵێت : ئەگەر کەسێ لەخەویدا بیبینێ لەشکری موسوڵمانان لەسەر زەوی کاراندا تالانی بکات ئەوا کافرەکان دوچاری بەلاو ئەشکەنجە دەبنەوە. بەلام ئەگەر بە پێچەوانەوە بێت ئەوا موسوڵمانان دوچاری بەلا و غەم دەبنەوە.

**تاریکی** : بینینی تاریکی لەخەودا لە ڕێگا لادانی دینە ئەگەر ببینێ تاریکی هەمووجێگەیەکی گرتەوە وە ئەو تاریکیە ڕوناك بویەوە تۆبە دەکاتو دەرگای دین بەڕویدا دەکرێتەوە.

**تاوس** : لێکدانەوەی تاوس لە خەودا پاشای عەجەمە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا تاوسی نێرەی هەبێ لە پاشای عەجەمەوە سەروەتی دەست دەکەوێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی تاوسی مێیەی هەبوو ژن دەهێنێت و منداڵی لێ دەبێت و سەروەت و سامان بەدەست دەهێنێ.

**تاوڵە** : ئەگەر لەخەویدا بینی یاری تاوڵە بکات بەڵگەی ئەوەیە کارێکی پڕوپوچ ئەنجام دەدات، ئەگەر بینی تاوڵەکەی لەبەرامبەر بردەوە بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێت وە ئەگەر دۆڕاندی تەعبیرەکەی پێچەوانەیە.

**تاعون** : تاعون لەخەودا بەڵگەی شەڕو دوژمنایەتیە، ئەگەر کەسێك لە خەویدا تاعونی بینی ئەوا دوچاری بەڵاو ئازار دەبێت.

**تەپڵ** :بینینی تەپڵ لەخەودا بەڵگەی قسەیەکی درۆیە، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی رەقس و نەی لەگەڵ تەپڵدا یێکەوە بن ئەوا کارێکی قازانجدار ئەنجام ددات.

**تەپو تۆز** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ تەپوتۆز نیشتبێتە سەر شتێکی ئەوا بەو ئەندازەیە سامان بەدەست دێنێ. ئەگەر لە زەوی‌و ئاسماندا تەپو تۆز ببینێ بەڵگەی ئەوەیە لەو شوێنەدا گرفتی سەخت دێتە پێش، ئەگەر تەپوتۆز لە ڕوخساری بنیشێ ئەوا دوچاری گرفت دەبێتەوە.

**تەرازوو** : بینینی تەرازوو لەخەودا قازییە ئەگەر ببینێ تەرازویەکی تازەت هەبێ یان کەسێ پێی دایت لەو شوێنەدا قازیەکی دروستکارو دادپەروەر پەیدا ددبێت وە تای تەرازو تاقەتو تەحەمولی

قازییه وه ئەو درهەمانەی کە لە ترازودایە ئەو شەڕو ناکۆکیانەیە کە دەچنە لای قازی وە سەنگی تەرازووەکە دادو ویژدانی قازییە کە لە نێوان دوو دوژمندا قەزاوەت دەکات وە ئەگەر ببینی تەرازووەکە ڕاست بێت بەلای هیچ کەسێکدا داناتاشێ بەڕێکی حکوم دەردەکات وە ئەگەر تەرازووەکە ڕاست نەبێ قازییەکە دروستکارو بە ویژدان نابێ.

**تەم** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ تەم هەمو جێگەیەك بگرێتەوە بەلگەی ئەوەیە سەری لێ دەشێوێت لەدیندا، ئەگەر ببینێ هەمو جێگەیەك بگرێتەوە بەڵام وردە وردە بڕەوێتەوەو ڕوناك بێت بەلگەی ئەوەیە وەزعو کاری بەرەو چاکی دەڕوات، ئەگەر ببینێ هەوا ڕوناك بێت بەڵام لەناکاو تەم هەڵ بکاتو هەمو شوێنێك بگرێتەوە لێکدانەوەکەی سەکتەو مردنی کتوپڕە.

**تەور** : تەور لەخەودا خزمەتکارێکە کە دەیەوێت کارێك ئەنجام بدات وە ئەگەر کارێکیان لێ داوا کرد بە چاکی ئەنجامی نادات لەبەر ئەوەی جارێکی تر کاری لێ داوا نەکەن. بە کورتی خزمەتکارێکی لاسارە.

**تەشت** : لێکدانەوەی تەشت لە خەودا رەنجەڕۆ و خزمەتکارە، ئەگەر کەسێك لە خەویدا تەشتێکی کڕی ئەوا لەگەڵ ژنێکی خزمەتکاردا هاوسەرگیری ئەنجام ئەدات، بەگشتی تەشت لەخەودا ژنەکە پێداویستیەکانی ماڵ دەپارێزێت.

**تەلاق** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ژنەکەی تەلاق بدات وەتەنها ژنێکی هەبێت ئەوە بەلگەی گەورەی و شەرەفی ئەو کەسەیە

بەلآم ئەگەر ژنێکی تری هەبێت وەیان کەنیزەکێك ئەوا لە پلەو پایەی ئەوکەسە کەم دەبێتەوە.

**تەختە** : لێکدانەوەی تەختە لە خەودا دوو روییە و هەندێکیش دەڵێن ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەخەودا تەختە ببینێت بینەری تەختەکە دوو رووە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کەسێك تەختەی پێبدات ئەو کەسە لەگەڵیدا بە دووڕووی رەفتار دەکات وە لێکدانەوەی تەختەی لار لە خەودا وەکو لێکدانەوەی تەختەی راستە.

**تەرم** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی تەرمێك دەبەن ئەوکەسەی کە تەرمەکەی دەبەن بەسەر ئەو گروپەدا کە بەشوێن تەرمەکەیەوە بوون دەبێتە حاکم بەلآم بەسەریاندا زوڵم و ستەم دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کە مردوە و تەرمەکەی دەبەن و خەڵکی لەپێش تەرمەکەی ئەودا بەڕێدا بڕۆن لێکدانەوەکەی ئەوەیە پلەو پایەی زیاد دەکات بەلآم لە کاری دونیایدا خراپە یان بەسەر ئەو خەڵکەدا کە لە پشت تەرمەکەیەوە بوون دەبێتە حاکم وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی تەرمی مردویەك هەڵبگرێت و بیبات بۆلای پاشا ئەوا سەرقاڵ دەبێت و سودو قازانجی دەست دەکەوێت وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی گروپێك بەشوێن تەرمەکەیەوە بەئاسماندا بڕۆن ئەوا پیاوێکی گەورەی خەڵکی ئەو شارە لەسەفەردا دەمرێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا تەرمی خۆی بینی کە بەسەر زەویدا رایبکێشن ئەوا بۆ سەفەر دەڕوات.

**تەرزە** : لێکدانەوەی تەرزە لەخەودا سزاو گرفتارییە لە دنیادا مەگەر تەرزەکە کەم بێت وە ئەگەر لەکاتی خۆیدا بێت بۆ خەڵکی ئەو جێگەیە نیعمەتی فراوانە بەڵام ئەگەر تەرزە لە وەرزو کاتی خۆیدا نەبێت خەڵکی ئەو جێگەیە دوچاری غەم‌و پەژارەو گرفتاری دەبنەوە.

**تەرخون** : تەرخون لەخەودا پیاوی بەدکردارو خراپە. ئەگەر ببینێ تەرخونی هەیە وە یان کەسێ پێی بدات، لەو کەسەوە زەرەرو زیانی پێ دەگات وە ئەگەر ببینێ تەرخون بە کەسێ بدات وە یان فڕێی بدات لە هاوڕێیەتی کردنی ئەو جۆرە پیاوانە بەدور دەبێ.

**تەرەکاڵ (سەوزەفرۆشی)** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا سەوزە فرۆشی کرد تەعبیرەکەی چاکە بەڵام خواردنی (سەوزە) لەخەودا نەخۆشی‌و هەژاری‌و پەژارەییە.

**تەسبیحاتکردن** : تەسبیحاتکردن لەخەودا، خواپەرستییە. ئەگەر ببینێ تەسبیحات بکات گوێڕایەڵی پەروەدگار دەبێ‌و لەغەم‌و پەژارە دەرباز دەبێ ئەگەر بینی تەسبیحی پێ بوو غەم‌و پەژارەی پێ دەگات بەڵام پاداشت‌و خێری تێدایە بۆی وە ئەگەر بە تەسبیح سوپاسی خوای گەورەی کرد لەکاری دیندا بەهێز دەبێ‌و سەروەت‌و سامان پەیدا دەکات. وە ئەگەر ئەم خەوە حاکمێك ببینێ وڵاتەکەی ئاوەدان دەبێت.

**تەکبیر (الله أکبر)** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا (الله أکبر)ی کرد لەشەڕی دوژمنەکانی پارێزراو دەبێ‌و دەرگای چاکەخوازی بەڕویدا دەکرێتەوە.

**تەواوبونی کار** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ کارەکانی دنیایی تەواو کردووە وە بە ئارەزووەکانو مەبەستی خۆی گەیشتووە شێوازی ژیانی پەشێو دەبێت وە ئەگەر بینی کارەکەی تەواو نەبووە شێوازی ژیانی دەگۆڕێتو ئەگەری ئەوەی لێ دەکرێت تەمەنی تەواو ببێ یان ستەم کارێکە کە تۆڵەی لێ دەسێنێتەوە.

**تەنگەبەری** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا لە جێگەی تەنگەوە بۆ جێگەی فراوان یان لە جێگەی ترسناکەوە بۆ جێگەی ئارامو ئاسودە بڕوات بەڵگەی ئەوەیە کارەکانی گونجاو رێك بەند دەبێت وە لە ئازارو ئەشکەنجەوە بۆ ئاسودەییو بەختەوەری دەڕوات وە ئەگەر پێچەوانەی ئەمانە ببینێ لێکدانەوەکەشی پێچەوانەیە.

**تەنور** : لێکدانەوەی تەنور لەخەودا سەرۆكو گەورەی میللەتە. وە پیاوی بەڕێوەبەری کاروباری ماڵە، هەندێکیش ووتویانە ژنو کەیبانووی ماڵە. ئەگەر ببینی تەنوری لەبەردەستدابێ لە کاروباری ماڵدا رێك بەنەدیو تەندروستی لەش پەیدا دەکات وە ئەگەر بینی تەنورەکە بکەوێتو خراپ بێت، بەڵگەی ڕەنجو نەخۆشیو ئازارو خراپ بونی کاروباری ماڵە، ئەگەر ببینێ لەتەنوردا نان بکات بە ئەندازەی ئەو نانانە رزقو رۆزی حەڵاڵ بەدەست دێنێو کاروبارەکانی چاك دەبن.

**تەورات** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ تەورات دەخوێنێتەوە لە کەسانی گرنگو بەناوبانگەوە یارمەتی پێ دەگات، وە ئەگەر ببینێ ڕوکەشانە تەورات دەخوێنێتەوە، لەگەڵ کەسێکدا ناکۆك دەبێتو شەڕ

دەکاتو بەسەریدا زاڵ دەبێتو بە ئاردزووەکەی دەگات، ئەگەر ببینێ تەورات فێری کەسێ دەکات لەو کەسەوە خێرو بەهرەی پێ دەگات.

تف : ئەگەر کەسێ ببینێ تف بکات قسەیەك دەکات کە ڕەواو دروست نەبێت وە ئەگەر ببینێ لە مزگەوت تف بکات لە کاروباری دینییەوە قسە دەکات، وە ئەگەر لەهەر جێیەکدا تفی کرد لەبارەی کاروباری ئەو جێگەیەوە قسە دەکات وە ئەگەر بینی تفی لە دیوار کرد ماڵو دارایی لەپێناو خوادا خەرج دەکات وە ئەگەر ببینێ تفی کردە سەر زەوی کێڵگەو باخ دەکرێت.

تازەبونەوە : لێکدانەوەی هەرشتێ تازەبێتەوە لەخەودا خێرو بەرەکەتە.

تۆو چاندن : ئەگەر کەسێ لەخەویدا تۆوی چاند وە بەرهەمەکەی کۆکردەوە، شەرەفو پلەوپایە بەدەست دێنێ وە ئەگەر ببینێ لەو بەرهەمەی کە چاندویەتی بخوات تەعبیرەکەی چاکتر دەبێت وە ئەگەر ببینێ لەوەی کە چاندویەتی بەرهەمی دەست نەکەوێت یان نەزانێت بەرهەمەکە چییەو ئەندازەی کەمو زۆرییەکەی نەزانێت دوچاری غەمو پەژارە دەبێت.

تێربون : کرمانی دەڵێ : ئەگەر کەسێك لە خەویدا تێر بێت ئەوا سەروەت مەند دەبێت. ئەگەر خۆی بە برسی و لاوازی ببینێت ئەوا دوچاری گوناهو تاوان دەبێت. چاکترین لێکدانەوە بۆ ئەو خەوەی کە نە تێر بێت و نەبرسی چونکە لە ئەندازەی ناوەڕاست و لەنگەر گرتودایە.

**ترشه سماق** : کرمانی دەڵێت : لێکدانەوەی خواردنی ترشه سماق لەخەودا، شەڕو دوژمنایەتیە. ئەگەر کەسێك له خەویدا بینی سماق بخوات، لەگەڵ کەسێکدا دوژمنایەتی دەکات. بەگشتی خواردنی سماق له خەودا هیچ قازانجێکی نیە.

**تور** : کرمانی دەڵێ : ئەگەر کەسێ لەخەویدا تور ببینێ دوچاری غەمو پەژارە دەبێتەوە به تایبەت ئەگەر بیخوات، ئەگەر ببینێ کەسێ توری پێ بدات لەو کەسەوە غەمو پەژارەی پێ دەگات بەلاّم ئەگەر ئەو توری بەکەسێکدا وەیان له ماڵەکەی فڕێیداتە دەرەوەو هیچی لێ نەخوات لەغەمو پەژارە ڕزگاری دەبێت.

**توتی** : بینینی توتی لەخەودا بەڵگەی نۆکەر و منداڵه. ئەگەر کەسێك له خەویدا بینی  توتی بەدەستەوە بەربێ منداڵەکەی سەفەر دەکات. ئەگەر کەسێك له خەویدا بینی  توتی لەگەڵی قسه بکات کارێك دەکات که خەڵکی پێی سەرسام دەبن. ئەگەر کەسێك له خەویدا توتی مێیەی بینی کچی دەبێت. وه توتی نێرە له خەودا بەڵگەی دیندارە وەیان نۆکەری دیندارە.

**توو** : ئەگەر کەسێ لەخەوی دا توو لەوەرزی خۆیدابخوات بەڵگەی ئەوەیە بەوئەندازەیە لەکاروکاسپی دا قازانج دەکات بەلاّم ئەگەر خواردنی توو له وەرزی خۆیدانەبێت خەم و پەژارەیە.

**تیر** : دانیال (ع) دەڵێت : تیر لەخەودا پیاوێکی ڕاستگۆیە که لەو پیاوەوە خێر به خەڵکی دەگات وە ئەگەر کەسێ ببینێ بەرەو ڕووی تیر بهاوێژرێ، پەیامێکی پێ دەگات. به تایبەت ئەگەر ببینێ به

ئەنقەست تیرەکە بتەقێنێ وە ئەگەر ببینێ خۆی بە ئەنقەست تیر بە کەسێکەوە بنێ نامە بۆ ئەو کەسە دەنێرێ.

**تینوێتی** : تەعبیری تێراوبون لەخەودا چاکترە لە تینوێتی. ئەگەر ببینێ زۆر تینووی بێو ئاوی دەست نەکەوێت توشی ڕەنجو ئازار دەبێت وە ئەگەر ببینێ تینووی بێو ئاوی دەست نەکەوێت وەیان کەسێ ئاوی پێ بداتو نەیخواتەوە لە ڕەنجو بەڵا دەرباز دەبێو سەرئەنجام بە ئارەزوەکانی دەگات.

**ترس** : تەعبیری ترس لەخەودا ئارامیو ئاسایشو ئۆقرەییە. ئەگەر لەخەودا ببینێ لەکەسێك دەترسێ وە ئەش زانێ ترسەکەی لەو کەسە چییە لەو کەسەوە ڕەنجو ئازاری پێ دەگات.

**ترێ** : لەخەودا خواردنی ترێ سەوزە کەلەوەرزی خۆی دا بێت بەڵگەی سەروەتێکە بەنارەحەتی بەدەست دێت، بینینی ترێی سورلەوەرزی خۆیدا بەڵگەی قازانجێکی کەمە وەهەرترێ یەك پێستەکەی ئەستوربێت بەڵگەی سامانێکە بەنارەحەتی دەست دەکەوێت. ترێ یەك پێستەکەی ناسك بێت بەڵگەی سامانی حەڵاڵە. ترێی سورباو بەڵگەی پلەو پایەیە وهەرترێ یەك شیرین ترو تازەتر بێت بەڵگەی پلەو پایەی زیاترە بەڵام ئەگەر ئاوی ترێ لێڵ و تەڵخ بێت بەڵگەی سەروەتی حەرامە.

**ترشی** : ترشی خواردن لەخەودا غەمو پەژارەو نیگەرانییە بە تایبەت میوە ترشەکان، ئەگەر ببینێ کەسێك ترشی پێ بدات لەو کەسەوە غەمو پەژارەی پێ دەگات وە ئەگەر ببینێ ترشی بە کەسێ

بدات غەم‌و پەژارە بەو کەسە دەدات. بەهەر شێوەیەك بێت ترشی هیچ خێرو چاکەیەکی تێدا نییە.

**تۆبەکردن** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا بینی تۆبە دەکات. لەهەموو گوناحەکانی تۆبە دەکات‌و کارگەلێك ئەنجام دەدات کە پەروەردگار بەلایەوە پەسەندن وە لە دنیا پەرستی دەگەڕێتەوە وە بە کارەکانی ڕۆژی کۆتاییەوە خەریك دەبێت.

**تلیاك** : ئەگەر کەسێك لەخەویدا بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی تلیاکی خوارد، لە ڕەنج‌و گرفتاری دەرباز دەبێ وە کارگەلێك ئەنجام دەدات کە دەبێتە هۆی فراوانبونی ئەو کەسە هەرچەندیش دژە بۆچونی تری هەیە واتە غەم‌و پەژارە هێنە.

## پیتی ( ج )

جام : کرمانی دەڵێت : ئەگەر لەخەودا ببینی جامێ پڕ ئاو یان گوڵاو لەدەست دابێ وەیان کەسێك پێت بدات وە لەو ئاوە یان گوڵاوەت خواردەوە، ژن ئەهێنی وە یان کەنیزەکێك دەکڕیت وە منداڵێکی ساڵح و پارسات دەبێت. ئەگەر ببینی جامە ئاوەکە کەوتە خوارەوەو جامەکە بە ساغی مایەوە منداڵەکە دەمرێت و منداڵ و دایکەکەش دەمێنێتەوە.

جاڵ جاڵۆکە : جاڵ جاڵۆکە لە خەودا لێکدانەوەکەی پیاوی بێ توانا و خراپە. ئەگەر کەسێ لەخەویدا بینی جاڵ جاڵۆکە بگرێ بەسەر ئەو جۆرە پیاوانەدا زاڵ دەبێت.

جادوگەری : جادوگەری کردن لەخەودا ـکاری پڕوپوچ کردنە، ئەگەر لەخەودا ببینێ جادوکەری بکات، کاری بێهودەو خراپ ئەنجام دەدات.

جەژن : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی جەژنی قوربان بێت ئەوا لەگەڵ کەسانی ئاقڵ و ژیر چاوپێکەوتن و دانیشتن دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی جەژنی رەمەزان بێت ئەوا لەلایەنی کەسانی چاکە خوازان و خوا پەرستانەوە سودی پێدەگات.

جەلایی کردن : جەلایی کردن لەخەودا بەلگەی پاشایەکی گەورەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی شتێك جەلایی بکات ئەوا بۆ خزمەتی پاشایەك دەڕوات.

**جەنگ** : لێکدانەوەی جەنگ لەخەودا نەخۆشی تاعونە. ئەگەر ببینێ لە جەنگو گۆڕەپانی جەنگدا دوژمن تێك بشکێنێ بەڵگەی ئەوەیە دەرباز دەبێت لە نەخۆشی تاعون، ئەگەر ببینێ دوژمن زا ڵ ببێت بەسەریدا لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

**جەواڵ** : بینینی جەواڵ لە خەودا بەڵگەی پیاوەتیە، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی جەواڵی گەورە و تازەی هەیە سودو قازانج دەبینێ وە ئەگەر جەواڵی بچوکی بینی ئەوا قازانجی کەمتر دەبینێ.

**جەواڵ دوور ( سوزن )** : لێکدانەوەی جەواڵ دوور ( سوزن ) لە خەودا پیاوێکە کارەکانی خەڵکی پێکەوە ببەستێ بە تایبەت کارە بچوکەکان، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی جەواڵ دوورێکی دەست کەوت یان کەسێك پێی بدات لەگەڵ ئەو کەسەدا دەبێتە هاوڕێ وە ئەگەر جەواڵ دورەکە شکا وەیان ون بوو ئەوا ئەوپیاوە دەمرێ.

**جل‌و بەرگ** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا جل‌و بەرگی هاوینەی پۆشی بێت بەڵام وەرزی زستان بێت ئەوا بە ئەندازەی نرخی ئەو جل‌و بەرگانە سەروەتی زیاد دەکات، ئەگەر بەرگی زستانەی لەبەردا بێت بەڵام وەرزی هاوین بێت بەڵگەی ئەوەیە دوچاری ترس‌و لەرز دەبێت، ئەگەر ژن لەخەویدا بەرگی پیاوانەی لەبەردابێت سودو قازانجی دەست دەکەوێت.

**جل‌و بەرگی خەو** : لێکدانەوەی جل‌و بەرگی خەو ژنە، ئەگەر بەرگی خەوەکەی پاك بێت ئیماندار دەبێت. ئەگەر بەرگی خەوەکە ڕەنگی ڕەش بێت بەڵگەی ئەوەیە بەدەست ژنەکەیەوە دوچاری خەم‌و پەژارە دەبێت. هەندێك دەڵێن بەرگی ڕەش لەخەودا بۆ پاشا چاکە

بەلام بۆ خەلکی ئاسایی خراپە. ئەگەر بەرگی خەوەکەی دڕاوو پیس بێت ئەوا ژنەکەی مالان گەڕو پیسو پۆخل دەبێت. ئەگەر ببینێ بەرگی خەوەکەی وون کردبێت یان دزرابێت بەلگەی ئەودیە ژنەکەی تەلاق دەدات. ئەگەر بەرگی خەوەکەی گڕ بگرێتو بسوتێ بەلگەی ئەوەیە ژنەکەی دەمرێت.

**جلو بەرگی کۆنە** : ئەگەر کەسێ لەخەودا جلو بەرگی کۆنە دابکەنێتو فڕێی بدات بەلگەی ئەوەیە لە خەمو پەژارە ڕزگاری دەبێت، بە گشتی هەمو شتێکی تازە لەخەودا لێکدانەوەکەی چاکەیە جگە لە جوزمە.

**جلو بەرگی مردو** : ئەگەر کەسێك لەخەویدا ببینێ مردویەك بەرگی جوانی لەبەر کردبێ بەلگەی ئەوەیە ئەو کەسە لەم دونیایەدا بە ئیمانەوە مردوە وە ئەگەر مردو بە جلو بەرگی سپییەوە ببینێ بەلگەی ئەوەیە لەڕۆژی دواییدا وەزعی باش دەبێت، ئەگەر ببینێ مردو بەرگی ڕەشی پۆشی بێت لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت. جلو بەرگی زەرد نیهانەی دەردو نەخۆشییە. ئەگەر ببینێ جلو بەرگ بکاتە بەر مردو بەلگەی ئەودیە مەرگی نزیك دەبێتەوە.

**جنێو** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا جنێو بدات بەلگەی ئەوەیە کە وەزع و حالی چاك و کارا دەبێت.

**جگەر** : لێکدانەوەی جگەر لە خەودا خۆش حالی و شادیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ئەندازەیەکی زۆر جگەر هەیە ئەوا خۆش حالْ و شاد دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی جگەر بەکەسێك بدات ئەوا خزمەتێك بەو کەسە دەکات.

**جگەر** : لێکدانەوەی جگەر لە خەودا سەروەتی شاراوەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا جگەری خەڵکی بینی سەروەتی شاراوە دەدۆزێتەوە و خەرجی دەکات، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ئەندازەیەکی زۆر جگەری برژاو یان سورەکراو یان کاڵی هەبێ ئەوا گەنجینە دەدۆزێتەوە وە جگەری مانگاو مەڕیش سەروەت و سامانە.

**جیماع** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەگەڵ ژنی خۆی یان هەر ژنێکی تر لە ڕێگای نادروست جوت ببێ پیاوێکی ناپەسەندەو بە شوێن کاری خراپەوەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەگەڵ دایکی یان خوشکی یان کەسێکی تر کە دەست نوێژیان لێ نەشکێنێ جیماع بکات ئەوا پەیوەندی نێوان خۆشەویستیان دەپچڕێت.

**جۆلا** : جۆلایی لەخەودا پیاوی گەشتیار یان تەتەرە کە لە جیهاندا هەمیشە دەگەڕێ وە ئەگەر ببینی جۆلا بەرگ بچنێ لەنێوان ئەو وە کەسێکی تردا جەنگ و ناکۆکی ڕوو دەدات.

**جۆگەلە ئاو** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا جۆگەلە ئاوی بینی بەلام جۆگە ئاوی سازگار و پاك ئەوا ژیانی ئەوکەسە خۆش و ئارام دەبێت، وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە جێگەیەکی نەناسراودا لە جۆگەلەئاوێکی پاك ئاوی خواردەوە ئەوا بەکارێکی نادیارەوە سەرگەرم دەبێ و تەمەنی درێژ دەبێت وە بەئەندازەی ئەو ئاوەی دەیخواتەوە سودو قازانجی دەست دەکەوێت وە ئەگەر ئاوەکە سوێرو تاڵ بێت ئەوە بەڵگەی تاڵی ژیانی دەبێت.

**جیوە** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چوە ناو کانی جیوە وە جیوەی هەڵگرت ژنەکەی کارێکی خراپ دەکات، ئەگەر جیوەکەی

خوارد دوچاری رەنج و زیان و ئازار دەبێت وە ئەگەر لەکانی جیوەکەدا نوقم بوو ئەوا ژنان سیحر و جادوی بۆ دەکەن.

**جوزمە ( چەکمە )** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا جوزمە ببینێ لە کاتێکدا چەك و ئەسڵەحەی پێبێت دوژمن دوچاری ترس و نیگەرانی دەکات وە ئەگەر جوزمەی بەبێ چەك و ئەسلاحە بینی دوچاری خەم و پەژارە دەبێت. بەلام ئەگەر جوزمەی چەرمی بینی ژن دەهێنێ.

**چاڵ** : لێکدانەوەی چاڵ لەخەودا سەروەتێکە کە بە فرۆفێڵ بەدەست بێت، ئەگەر لەخەودا لە چاڵێکدا خۆی شاردبێتەوە بەلام ڕێگای دەربازبونی نەبێ بەلگەی ئەوەیە ناچاری دەکەن بە کارێك کە بەفرۆفێڵ لێی دەرباز دەبێت.

## پیتی ( چ )

چاڵ ( بیر ) : لێکدانەوەی چاڵ لە خەودا ژنە. ئەگەر کەسێک لە خەویدا بینی لە شوێنێکدا چاڵ هەڵ بکەنێ ئەوە داوای ژنەکات، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە هەڵکەندنی چاڵەکەدا کەسێك یارمەتی دەدات لە نێوان ئەوو ژنەکەدا کەسێك پەیدا دەبێت کە بە فرت و فێڵ دەیەوێ ئەو دوو کەسە بنە هاوسەری یەك چونکە چاڵ هەڵکەندن مەکرو حیلەیە هەر وەك پەند هەیە لەوبارەوە (( فلاّن بۆ فلاّن چاك هەڵدەکەنێ )) وە ئاو لە چاڵدا بەڵگەی سەروەت و سامانی ژنە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە چاڵێکدا یان بیرێکدا ئاو بخواتەوە ئەوە لەسەروەتی ژن دەخوات، وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ئاوی خواردەوە لە بیرێك وە ئەو بیرەش لە خشت دروست کرابێت دیسانەوە خواردنە لە سەروەت و سامانی ژن.

چارشێو ( عابا ) : عابا لە خەودا داپۆشینی ژنە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی وەك و ژن چارشێوەی لەبەرکردبێت ئەوا کارێك دەکات کە لەوکارەدا هەم خێری تێدایە هەم شەڕ وە ئەوکارەش خەڵکی بە ناپەسەندی دەزانن. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چارشێوە بدڕێنێ وە یان بسوتێنێ ئەوا پەردەی رێزی خێزانەکەی بە دڕاندن و شێواندن دەچێت.

چەقەڵ : ئەگەر کەسێك لە خەویدا لەگەڵ چەقەڵ شەڕی کرد ئەوا لەگەڵ خزمەکانی خۆیدا شەڕ دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا

بینی چەقەڵ خۆی تێ هەڵبسوێ ئەوا لە هیچ کەس ناترسێ. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چەقەڵ یاری بکات ئەوا عاشقی ژنێك دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی گۆشتی چەقەڵ بخوات ئەگەر نەخۆش بێت چاك دەبێتەوە وە ئەگەر قەرزار بێت قەرزەکانی دەداتەوە.. گۆشت و ئێسقانی چەقەڵ لە خەودا بەڵگەی سەروەت و سامانە.

**چەوەندەر** : لێکدانەوەی چەوەندەر لە خەودا خەم و پەژارەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چەوەندەر دەخوات بە ئەندازەی ئەوەی کە دەیخوات خەم و خەفەت دەخوات، وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چەوەندەر لەماڵ فڕێ بداتە دەرەوە لە خەم و پەژارە دەرباز دەبێت وە هەروەها هەندێ خەڵك دەڵێن چەوەندەر لە خەودا سودی کەمێك لە ژیانە.

**چەك ( چەکی بانکی )** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چەکی مۆرکراو یان واژۆکراوی پێدرا وەیان بیدۆزێتەوە سەروەت و سامان پەیدا دەکات.

**چەکوش** : لێکدانەوەی چەکوش لە خەودا پلەوپایەو گەورەییە. ئەگەر کەسێ لە خەویدا چەکوشێکی هەبێت وە یان کەسێك پێی بدات لەگەڵ سەرکردەیەکدا چاوپێکەوتن دەکات و دادەنیشێت و سودی لێدەبات وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چەکوشەکەی لێون بوو لە چاوپێکەوتنی گەورە پیاوان و دانیشتن لەگەڵیاندا بەدوور دەبێت.

چاو : لەخەوی پیاودا لێکدانەوەی چاو بیابانیە کە بەهۆیەوە ڕێگای ڕاست دەست نیشان دەکات وە چاوی شین بیدعەیە وە چاوی گەورە منداڵە وە دووچاو دوو منداڵە. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کوێر بووە ئەوە ئەوکەسە گومڕایە وە یان منداڵی دەمرێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چاوێکی کوێر بووە نیوەی دینی لەدەست دەدات وە یان گوناهێکی گەورە بە یەکدەست یان بە یەك قاچ ئەنجام دەدات وە یان ئازارێك بەخۆی دەگات یان لەو کارانەی پەیوەندی بەوەوە هەیە دوچاری گرفت دەبێتەوە.

چەتر : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کە بەسەر سەریەوە چەتریان گرتبێت ئەگەر شایستەی دەستەی پادشایەتی بێت ئەوا دەبێتە پادشا وە ئەگەر شایستەی پادشایەتی نەبوو ئەوە پلەو پایەیی بەرز دەبێتەوە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چەتری پادشای بەدەستەوە بێت لەلای پادشا خۆشەویست و ئازیز و گەورە دەبێت.

چەتە : ( ڕێگر ) : لەخەودا لێکدانەوەی چەتە پیاوێکە کەلەگەڵ خەڵکدا شەڕ دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چەتەیی بکات و سەروەتی زۆری بەدەست هێنا بێت ئەوا لەگەڵ پیاوێك چاوپێکەوتن دەکات کە بەلایەوە ئازیز و خۆشەویستە و بە ئەندازەی ئەوشتانەی لێی سەندوە سودی لێ وەردەگرێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ژمارەیەك چەتە لەدەوریدا کۆبوبونەوە بەلام نەتوانن شتێکی لێ بدزن ئەوا دژواری نەخۆشیەکی لێدەردەکەوێت بەئەندازەیەك کە چاوەڕوانی مەرگی لێدەکرێت بەلام سەرئەنجام چاك دەبێتەوە.

چەم ( روبار ) : لەخەودا لێکدانەوەی چەمی گەورە پیاوی گەوردیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بچێتە چەمێکی گەورەو ساف ئەوا لەگەڵ پیاوێکی گەورەدا چاوپێکەوتن و دانیشتن دەکات. ئەگەر بۆ چەمێکی گەورە بڕوات کە ئاوەکەی لیڵ بێت و بنی ئاوەکە لیتە بێت ئەوا لێکدانەوەکەی پێچەوانەی ئەوەیە، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەوچەمەدا نوقم ببێت ئەوا بەڵگەی ئەوەیە تاکاتی مەرگ لە خەم و پەژارە رزگاری دەبێت. هەرچەندە چەمەکە یان روبارەکە گەوردتر و سافتر بێت ئەوپیاوە گەورەتر و پاکتر دەبێت. وە هەرچەندە لیڵ تر بێت ئەوا ئەوپیاوە ستەم گەر تر دەبێت.

چوارپێ : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چوارپێیەکی گرت و ئەو چوارپێیەی رام و دەستەمۆ کرد بە ئەندازەی ئەوە لە پیاوی بیابان نشینەوە سودی پێ دەگات. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کۆمەڵێك لە چوارپێ بیابانیەکان لە بەردەمیدا بوون هەمووشیان رام و ماڵی بن. گروپێ لە خەڵکی بیابان نشین گوێ ڕایەڵی ئەو پیاوە دەبن.

چیرۆك : ئەگەر کەسێك لەخەویدا چیرۆك بۆ خەڵکی بگێڕێتەوە بەڵگەی ئەوەیە لە دەستی ستەمکاران و زۆرداران پارێزراو دەبێت.

چێشت لێنەر : ئەگەر کەسێك لە خەویدا چێشت لێ بنێتو خواردنی خۆش دروست بکات ئەوا لەلایەن پاشاوە سودو قازانجی پێدەگات، ئەگەر خواردنی ناخۆشی دروست کرد لێکدانەوەکەی پێچەوانەیە.

**چەناگە** : لێکدانەوەی چەناکە لە خەودا گەورەی هۆز و خاوەن کارە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چەناکەی گەورە و پان بێت لە پێش خزم و خوێش و خێزانەکەیدا لاسار و نەفام دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە چەناکەیەوە خوێن بێتە خوار، بە ئەندازەی ئەو خوێنە لە گەورەی هۆزەکەیانەوە زیانی پێ دەگات.

**چۆلەکە** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی راوی بێچوە چۆلەکە بکات و ملیان هەڵبکەنێ و بیانخاتە ناو کیسەیەکەوە دەبێتە مامۆستای منداڵان و زۆر بە توندی پەروەردەیان دەکات ( واتە بە رەقی لەگەڵیان دەجوڵێتەوە ). وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چۆلەکەی سور راو بکات ئەوا ژنێکی جوان دەهێنێ. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چۆلەکەی زەرد راو بکات ژنێکی نەخۆش و ڕەنگ زەرد دەهێنێ.

**چنگ** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی وەك و باڵندە شکار چیەکان چنگی هەبێت لە کاروکاسپی و بژێوی رۆژانەیدا بەهێز دەبێ و بەسەر دوژمنەکانیدا زاڵ دەبێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چنگی باڵندەکانی بەدەستەوە بێت بە ئەندازەو نرخی ئەو باڵندیە سودو قازانجی پێ دەگات.

**چیمەن ( سەوزەلانی )** : لێکدانەوەی چیمەن زار لە خەودا دینی پیرۆزی ئیسلام و موسڵمانیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خاوەنی چیمەنەکە کەسێ تر بوو وە ئەو تەماشای کرد ئەوا لەگەڵ کەسانی چاوگەورەدا دەبێتە هاورێ. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی

لە چیمەنی خۆیدا دەگەڕێت لە کاروباریدا خۆش گوزەرانی و فراوانی پەیدا دەبێ و سەرئەنجامی بە خێرو چاکە دەبێت.

**چرا** : کرمانی دەڵێ : لەخەودا لێکدانەوەی چرا خزمەت کاری ماڵە هەندێك لە لێکدەرەوانی خەویش ئەڵێن ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چرایەکی پاك و رۆشن داگیرسابێت کەیبانوی ماڵەکە ژنێکی دروست کار و خۆش رەفتار دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چراکە کز و تاریك بسوتێ ئەوا کەیبانویماڵەکە یان خزمەت کارەکە دووچاری رەنج و ئازار دەبێت وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چراکە بکوژێتەوە. کەیبانوی ئەو ماڵە دەمرێت.

**چڵك** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی جلوبەرگی پیس و چلکنی لەبەردابوو ئەوانەوکەسە خراپە کار و گوناهکارە وە هەرکەس بینی جلوبەرگی چلکن وەیان هەرشتێکی تر پیس ببێ دین و دنیای خراپ دەبێت، وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی جلوبەرگی بەهۆی مردوەکانەوە پیس ببێت بەڵگەی ئەوەیە لە دیندا خراپ دەبێت بەلام لە دونیادا خۆش بەختەوەر و کامەرانە.

**چێشتخانە** : چێشتخانە لەخەودا ژنێکی خزمەتکارە ئەگەر ببینێ لەماڵەکەی خۆیدا مەتبەخێکی لە خشتی‌ فورِ دروست کرد ژنێکی دیندار دێنێ وە ئەگەر لەگەچو خشت دروستی کرد ئەو ژنە بێ دین دەبێ وە ئەگەر لە خەودا بزانێت ئەو چێشتخانەیە خۆی خاوەنی نییەو کەسێکی تر خاوەنیەتی خێرو شەڕی ئەو چێشتخانەیە بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە .

**چـاکەکردن** : لێکدانـەوەی چـاکەکردن لەخـەودا، گـەورەیی و پلەوپایەیە لەدنیاداو پاداشت وەرگرتنە لەڕۆژی کۆتاییدا.

**چیلکەی ددان** : لەخەودا لێکدانەوەی چیلکەی ددان چاك نیە چونکە ددانەکان لەخەودا خێزانی بینەری خەوەکەیە وە چیلکەکەش وەك و گسکێك وایە کە دەدرێت لە خێزانەکەی. وە هەر کەس ببینێ لە خەویدا چیلکە بدات لە ددانی بەڵگەی ئەوەیە بە ئەندازەی ئەو پیسیەی لە ددانەکانەوە دەر دەهێنرێت لە سەروەت و سامانی خێزانەکەی کەم دەبێتەوە.

**چڵم** : بینینی چڵم لە خەودا منداڵە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چڵم چوبێت لە جلوبەرگەکەی بەڵگەی ئەوەیە کوڕێکی دەبێت، وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چڵم بە لوتیدا بێتە خوارەوە ئەوا بەڵگەی ئەوەیە کە کچێکی دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چڵم بدات لە ژنەکەیەوە ئەوا ژنەکەی حامیلە دەبێت بەڵام ژنەکەی نوقسان دەبێت وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ژنەکەی چڵمی لێ بدات کوڕی دەبێت، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چڵم بدات لە قاپی هاوسێکەیەوە ئەوا لەگەڵ ژنی هاوسێکەیدا سەرگەرمی کاری فەساد دەبێت، وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چڵم بدات لە جێگەی خەوی پیاوێکەوە لە گەڵ ژنەکەیدا خیانەت و فەساد دەکات. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چڵم بخوات ئەوا سەروەتی ژن دەخوات.

**چرۆ** : چرۆ بینین لەخەودا ئەگەر لەوەرزی خۆیدا بێت خێرو چاکەیە. چرۆی درەختەکان بەڵگەی قسەی خۆش و خەندەدارە.

ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی چرۆ و خەندە بۆن بکات ئەوا خەڵکی باسی لێوە دەکەن و وەسفی دەکەن.

## پیتی ( ح )

**حاجی لەق لەق** : لێکدانەوەی لەق لەق لە خەودا پیاوی بێ ئازار و دوور بینەو ئەسڵ زادەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەق لەقی هەبێت لەگەڵ پیاوی بێ ئازار و دوور بین و ئەسڵ زادەدا دادەنیشێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەق لەق بەسەربانەکەیەوە بنیشێتەوە ئەوا سەرۆك یان گەورەیەك دێت بۆ ماڵی. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەق لەق بکوژێت ئەوا دوژمن بەسەریدا زاڵ دەبێت.

**حەڵوا** : لێکدانەوەی حەڵوا لە خەودا ماڵی حەرامە کە لە دەستی پاشادابێت وە حەڵوای وشك غەم و پەژارەیە لەبەر زەردی زەعفەرانەکە تێیدا بەکار برابێت.

**حەماڵی** : لێکدانەودی حەماڵی لە خەودا زۆری گوناه و تاوانە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی حەماڵی بکات بە ئەندازەی ئەو بارەی کە بە کۆڵیەوەیە خەم و پەژارەو نارەحەتی پێ دەگات.

**حەوز** : بینینی حەوز لە خەودا زانایی و داناییە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خۆی لە حەوزدا بشوات لە کارەکانیدا سەرکەوت و دەبێتو لە گوناح و تاوان دەست هەڵدەگرێ، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی هەموو ئاوی حەوزدکە بخواتەوە و بەلایەوە سازگار بوو تەمەنی بە سەلامەتی دەباتە سەر و سەروەتی زیاد دەکات و ئەگەر حەز لە زانست بکات زانستی زیاد دەکات.

**حەب خواردن** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا بە مەبەستی چارەسەری نەخۆشی حەب بخوات وە ئەو حەبانە ببێتە هۆی چارەسەرکردنی ئەوا لە کاروبارەکانیدا سودو قازانج دەبینێ وە ئەگەر سودی لە حەبەکان نەبینی ئەوا لێکدانەوەی پێچەوانە دەبێت.

**حەج کردن** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بۆ حەج دەڕوات بەڵگەی ئەوەیە کە خواوەند سەرکەوتوی دەکات لە چونی بۆ حەج کردن. وە ئەگەر نەخۆش بێت ئەوا شفا پەیدا دەکات، وە لە شتێك بترسێ پارێزراو دەبێت. وە ئەگەر قەرزار بێت قەرزەکەی دەداتەوە. وە ئەگەر لەسەفەردا بێت بەبێ زیان دەگەڕێتەوە. ئەگەر لەخەودا ببینێ بۆ حەج دەڕوات بەڵام نەتوانێ مەراسیم و کارەکانی ئەوێ ئەنجام بدات بەڵگەی ئەوەیە تەمەنی درێژ دەبێت و کاروبارەکانی ڕێکبەند دەبن.

**حەرەم** : حەرەم بە زمانی تازی و عەرەب بە واتای جێگەی ئارام و شوێنی ئاسایشە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە حەرەمی کەعبەدا بێت لە ئافات و بەڵای دونیا پارێزراو دەبێت و بەرەو حەج بەڕێ دەکەوێت.

**حساب** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی حساب دەکات وەیان لەگەڵ کەسێکدا حساب بکات دەکەوێتە ناو ڕەنج و ئازارەوە و دوچاری کارێکی ناشیرین دەبێتو خەڵکی تانەی لێ دەدەن.

**حەوشە ( دیوار )** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بچێتە ناو حەوشەوە، لە شەڕی دوژمنان پارێزراو دەبێت، ئەگەر کەسێك لە

خەویدا بینی  لە حەوشەوە بێتە دەرەوە وە یان کەسێ لە حەوشە دەری بکات، دوژمن بەسەریدا زاڵ دەبێت.

**حوقە ( قاپی بچوکی خشڵ و گەوهەر )** : لێکدانەوەی حوقە لە خەودا ژن یان کەنیزەکە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی حوقەی تازەی کڕی یان کەسێك پێی بدات ئەوا ژن دەهێنێت یان کەنیزەکێك دەکڕێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی  حوقەکەی بشکێ یان ون ببێت ژنەکەی لێی جیا دەبێتەوە یان دەمرێت.

**حجامەت کار ( خوێن گر )** :  ئەو جۆرە خوێنگرە بەمەبەستی دۆزینەوە و پشکنینی خوێن لە خەڵکیدا دەکرێ : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی  کە خوێن گرێکی نەناسراو لە جێگەیەکی نامۆدا خوێنی لێ بگرێت ئەوا کتێب دەنوسێ و دەبێتە والی حوکومەت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی  دۆستێك خوێنی لێ بگرێ ئەمانەتێکی پێ ئەسپێرێ، وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دوژمنێك خوێنی لێ بگرێت لە شەڕی ئەو کەسە پارێزراو دەبێت و لە پەژارە دوور دەکەوێتەوە. وە ئەگەر ئەوکەسە لاوبێت لێکدانەوەکەی هەر وایەو ئەگەر پیریش بێت پلەو پایەی دەست دەکەوێت.

**حجرالاسوەد** ( بەردێکی رەشی دیواری ماڵی خوایە ) : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی  دەست بهێنێ بەو ( حجرالاسود ) دا لە خەڵکی عەرەبستانەوە سودو قازانجی پێدەگات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ( حجرالاسود ) لەجێی خۆی هەڵبکەنێ بێ مەزهەبو بێ باوەڕ دەبێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ( حجرالاسود )

لەسەر جێی خۆی دابنێ دیسانەوە بۆ ڕێگای ڕاست و ڕەوان دەگەڕێتەوە.

**حیکمەت ( زانست و دانایی ) :** ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی حیکمەت و زانست بخوێنێت لە قورئان خوێندندا سەرکەوت و دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کتێب دەربارەی زانست و دانایی بکڕێت ئەوا قورئانێك دەکڕێت، وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کتێبێکی حیکمەت و دانایی بسوتێنێ دینی لاواز و خراپ دەبێت.

**حەوزی کەوسەر :** ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی حەشر هەڵسابێ و خەڵك لەدەوری حەوزی کەوسەر کۆ بکەنەوە بەڵگەی ئەوەیە کە پاشایەك دێتە سەر حوکم لە نێوان خەڵکیدا بە ویژدان و دادوەر فەرمان ڕەوای دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی جامێك لە ئاوی حەوزی کەوسەر بخواتەوە بە ئیمان و باوەڕەوە لە دونیا دەردەچێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە دەوروبەریدا حەوزی کەوسەر بسوڕێتەوە و داوای ئاو بکات بەڵام ئاوی پێنەدەن بەڵگەی ئەوەیە لەگەڵ بنەماڵەی پێغەمبەردا ( د. خ ) دوژمنایەتی دەکات، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی پێغەمبەر ( د. خ ) ئاوی پێ بدات و بیخواتەوە لەشەفاعەتی ئەو پێغەمبەرە ( د. خ ) بەهرە دەبات.

## پیتی ( خ )

**خانو** : لێکدانەوەی خانوی تاك و تەنها لە خەودا ژنە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خانو یان دەرگای خانوەکە لە جێی خۆی بەرزبکاتەوە ئەوا ژنێکی میهرەبان دەهێنێت کە خەرجیەکەی ژنەکە دەیگرێتە ئەستۆ وە رەنگە ژنەکەشی حامیلە ببێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەدەرگای تازەدا بڕواتە ژورەوە ژن دەهێنێت و دەوڵەمەند دەبێت. ئەگەر بینی خانویەکی تاك و تەنیا و گەچکاری کراو بێت وە نەزانی کێ خاوەنی خانوەکەیە ئەوا دەمرێت وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی رای کردە ناو خانوێکەوە و دەرگای خانوەکە کلیل نەدات وە ئەو خانوەش خانوی کەسێکی تربوو ئەوا لەغەم و پەژارە رزگاری دەبێت وە ئەگەر نەخۆش بێت چالاك دەبێتەوە بەلاّم ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەرگای خانوەکەی خۆی شکاند لە کەسێکەوە سەروەتی پێدەگات.

**خاچ ( صلیب )** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خاچ بکرێت وە یان کەسێك پێی بدات بەلگەی ئەوەیە کە لە دین و باوەڕی ئەو کەسەدا کەم و کوڕتی تێدایەو حەزی لە گوناهو کافرییە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خاچی لەمل کردبێت ئەوا دین و ئیمانی راستەقینەی نیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خاچ پەرستی بکات ئەوا شەریك بۆ پەروەردگار دروست دەکات.

**خەم و پەژارە** : لێکدانەوەی خەم وپەژارە لە خەودا شادی و خۆش حالّیە. ئەگەرلە خەم و پەژارە رزگاری بوبێت ئەوا گرفتاری

خەم و پەژارە دەبێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی غەمگین و پەژارەبێت ئەوا خۆش حاڵ و شاد دەبێت.

**خەڵکی** : ئەگەر کەسێك لەخەودا ببینێ خەڵکی جلو بەرگی سەوز یان سپی یان لەبەرکردبێت بەڵگەی ژیانی خۆشو کامەرانییە، ئەگەر ببینێ بەرگی خەڵکی ڕەش بێت لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت، ئەگەر ببینێ خەڵکی بەرگی گەورە یان لەبەردابێت بەڵگە نیعمەتی زۆرو ژیانی کامەرانییە.

**خەڵوز** : لێکدانەوەی خەڵوز لە خەودا سامانی حەرامە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەشوێنێکدا خەڵوز بەدەست بێنێ وەیان کەسێك پێی بدات ئەوا سەروەتی حەرام بەدەست دێنێ. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خەڵوز بخاتە ناو ئاگرەوە ئاگرەکە داگیرسا بەڵگەی ئەوەیە کە بەسەروەتی پاشا مامەڵە لەگەڵ پاشادا دەکات و سود لەو مامەڵەیە دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی جلو بەرگەکەی یان لەشی بە خەڵوز ڕەش ببێت ئەوا لەلایەن پاشاوە ئازارو ئەشکەنجەی پێ دەگات.

**خەنجەر** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خەنجەری بەدەستەوە بێت لەگەڵ کەسێك دوژمنایەتی دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خەنجەرەکەی بشکێت یان ون ببێت جەنگ و ناکۆکیان تەواو دەبێت و ئاشت دەبنەوە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خەنجەر بەتەنیا بەبێ چەك و ئەسلاحەی تر بە دەستیەوە بێت لەوکارەدا مەبەستی ئەنجام دانیەتی یارمەتی دەدرێت. ئەگەر کەسێك

له خەویدا بینی لەگەڵ خەنجەر دا چەکی تری بەدەستەوە بوو بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێت و کارو بارەکانی ڕێك بەند دەبێت.

خەندە : لێکدانەوەی خەندە لە خەودا غەم و پەژارەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بە قاقا پێ بکەنێ خەم و پەژارەکانی زیاد دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی هێواش پێ بکەنێ خەم و پەژارەکانی کەم دەبنەوە.

خەساندن : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خۆی بخەسێنێ بەڵگەی ئەوەیە لەکاتی شەڕکردن لەگەڵ دوژمندا لاواز و زەبوون دەبێت بەڵام حەز لە پەرستنی خودا دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کەسێکی نەناسراو پاك و دروستکار خەسابێت و لە چوارچێوەی زانست و زانیاریدا قسە بکات بەڵگەی ئەوەیە کە ئەوکەسە فریشتەیە و بانگی دەکات بۆ ڕێگای ڕاست و دینداری مژدەی پێ دەدات چونکە فریشتەکان شەهوەتی پیاویان نیە وە ئەگەر لە قسەکانیدا زانست و حیکمەتی تێدا نەبێت فریشتە نیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کەسێکی ناسراو خەسابێت هەر ئەوەی لە خەوەکەیدا دەیبینێ چاك و خراپی پەیوەندی بە کەسەکەوە هەیە.

خەرتەلە : خەرتەلە خواردن لە خەودا نیگەرانی و خەم و پەژارەیە یان کەم بوونی دارایی یان نەخۆشیە.

خەرمان : بینینی خەرمان لە خەودا بەڵگەی پیاوێکە بە ڕەنج و زەحمەتەوە سەروەت کۆ دەکاتەوە و بەبێ هودە بۆ ژنەکەی خەرج دەکات ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خەرمانی خەلە ( گەنم ) بکرێ وەیان کەسێ پێی بدات ژن دەهێنێ وە هەندێکیش دەڵێن

لەگەڵ پیاوێکدا چاو پێکەوتن دەکات کە بە زەحمەتەوە سەروەت و سامان بەدەست دەهێنێ.

**خەلیفە** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خەلیفە خۆشحاڵ و رو خۆش بێت و لەگەڵیدا بە نەرمی و میهرەبانیەوە لەگەڵیدایە وە قسە بکات ئەوا خێری دین و دونیایی پێ دەگات. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خەلیفە فرمانی ئەنجام دانی کارێك لە کارەکان بدات بەسەریدا ئەوا پلەو پایە بەدەست دێنێ وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بچێت بۆ ماڵی خەلیفە ئەوا دەبێتە نزیکەکان و هاوڕێکانی خەلیفە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خەلیفە شتێك لە نیعمەتی دونیایی پێ ببەخشێت ئەوا دەبێتە کەسە بەناو بانگەکان و پلەو پایەی زیاد دەکات.

**خەیار** : لێکدانەوەی خەیارلەوەرزی خۆیدا بیستنی قسەی خۆشە یان ژنێك حەزی لێ دەکات، ئەگەر لەوخەیارەی

خوارد بەڵگەی ئەوەیە بەئارەزووەکانی دەگات وەلێکدانەوەی خەیار چەمەریش هەرهەمان شێوەیە.

**خەتەنەکردن** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کەسێك خەتەنەی بکات ئەوە بە سونەت و رێبازی پێغەمبەر ( د. خ ) کاردەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی جوان خەتەنە نەکرابێ بەڵگەی ئەوەیە سەروەت و سامانی دونیایی زیادیدەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خەتەنە بکات سونەتێك ئەنجام دەدات کە لە گوناهەکان بەدوری دەخات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەکاتی خەتەنەکردندا خوێنی لێ هات تۆبە لە گوناهەکانی دەکات،

ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەکاتی خەتەنەکردنەکەیدا سەیری خەتەنەکە بکات دوچاری خەم و پەژارە دەبێتەوە.

خەنە : کرمانی دەڵێ : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەست و قاچی خۆی خەنە بکات، خزم و خوێش و ئەندامانی خێزانی خۆی ئارایشت و جوان دەکات بەڵام بۆ قیامەت و دونیای باش نیە.

خەوتن : لێکدانەوەی خەو لە خەودا بۆ کەسی خەوت و وەیان بۆ کەسێ کە ترس و هەراسی هەبێ ئاسایشی و ئارامیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کەسێك لەسەر تەختە خەوێك یان دۆشەکێك خەوتو بێت پلەو پایەی دەست دەکەوێت بەڵام لە کارو باری دین و پارێزگاری بەدور دەبێت چونکە خەوتن لە کاروبار دیندا غافڵ بوون و بێ ئاگاییە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە جێگایەکی تەسك و خراپدا خەوت و بێت ئەوە بەڵگەی لارو خراپی ئەو کەسەیە.

خــۆرو هەســارەکان : بینینـــی خــۆر لەخــەودا پادشــایەکی گەورەیە، مانگ وەزیری پادشا، زوهرە ژنی پادشا وە عـەتارد نوسـەرو ڕاوێژکاری پادشـایە وە مـەریخ سوپاسالاری پادشـایە وە ئەستێرەکانی تر سوپاکەی ئـەون ئـەگـەر ببینـێ خـۆرێکی پـاكو ڕونـاك هـەڵهات وە تیشك بۆ خانوەکەی ئەو بهاوێژێ لەخزمەکانی خۆی ژن دێنێ، ئەگەر ببینێ هەور یان شتێکی تـر بـەری خـۆری گـرت حـاڵی پادشـا خـراپو وێران دەبێ. ئـەگەر ببینێ لە لێڵی یەوە بێتەدەر ڕوناك بێتەوە پادشـا نـەخۆش دەکـەوێت بـەڵام خێـرا چـاك دەبێتـەوە وە ئەگـەر بینـی بـە تیشکی خۆرەوە خوری ڕستراو یـان شـتێك هەڵواسـرابو وە ئـەو چـنگی

لەو شتە گیرکرد لەلایەن پادشاوە هێزوتوانای پێ دەگات وە ئەگەر ببینێ خۆرو مانگو ئەستێرەکان هەمویان لێڵ بون بینەری خەوەکە توشی دەردی سەری‌و ماندوبون دەبێت.

**خواردەمەنی** : لێکدانەوەی خواردەمەنی بەتام و بۆن خۆشەکان لە خەودا چاکی و چاکە خوازییە وە خواردەمەنیە نا جۆر و ناخۆشەکان بەلگەی شەڕ و خراپیە. خواردنی سیر و پیاز لە خەودا بەلگەی خەم و پەژارە و خراپی کاروبارە. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خۆراکی تاڵ و ناخۆش بخوات دوچاری هەژاری دەبێتەوە.

**خواردن** : دانیاڵ ( ع ) دەڵێ : لێکدانەوەی خواردن لە خەودا سێ لایەنی هەیە. هەر خواردنێك بێ ئاکام بێت بەلگەی ئازار و خەم و پەژارەیە، خواردنی ترش بەلگەی نەخۆشیە، وە خواردنی شیرین بەلگەی ژیانی خۆش و کامەرانیە.

**خوێ** : لێکدانەوەی بینینی خوێ لەخەودا سەروەتە، ئەگەر ببینێ خوێی سپی هەبێت، سەروەت بەدەست دەهێنێ، ئەگەر وورده خوێی هەبێت، دەبێت بە زاهیدو خواپەرست هەندێکیش دەڵێن بینینی خوێ لەخەودا بەلگەی شەڕو ناکۆکییە.

**خوێن** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەبێ زام و برین خوێن لە لەشی هاتە خوار بەلگەی ئەوەیە کە ئەگەر بەرتیل خۆربێت بەرتیل وەردەگرێت وە ئەگەر بەرتیل خۆر نەبێت زەرەرو زیانی پێدەگات. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی برین بەلەشیەوەیە و خوێنیان لێبێت ئەو کەسە دوچاری پەژارەو غەم و

زیان دەبێتەوە، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کەسێك بە شمشێر لە لەشی بدات و خوێنی لێبێتە خوار ئەوا خەڵکی بە خراپە باسی دەکەن و سەرزەنشتی دەکەن بەلاَم خێرو پاداشتی بۆ ئەو کەسە دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەوجێیەی کە زام و برینە و خوێنی لێبێتە خوار و جلو بەرگەکەی پیس بکات ئەوا لە رێگەی نارەواوە سەروەت و سامان بەدەست دێنێت.

**خۆرئاوابون** : لێکدانەوەی خۆرئاوابون لەخەودا باش نییە چونکە شوێنی ئاوابونی خۆرە.

**خیگە** : خیگەی شیرو ماست لە خەودا بەڵگەی پیاوێکە کەسەروەت و سامانی حەلاَڵ لە کارگەلی وەك کاروان سوار و مزگەوت و پرددا خەرج دەکات. وە خیگەی هەنگوین پیاوێکە زانایە کە زانست فێری خەڵکی دەکات و ئامۆژگاری خەڵك دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خیگەی هەبێت وە یان کەسێك پێی بدات لەگەڵ پیاوی لەو جۆرە دادەنیشێو دەبێت بە هاورێی و خێری لێ دەبینێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خیگەی لەت لەت کرد وەیان ونی بکات لەگەڵ ئەو جۆرە پیاوەدا جیا دەبێتەوە.

**خێرکردن (صدقە کردن)** : ئەگەر کەسێکی زانا لەخەودا ببینێ خێر دەکات ئەوا لە ژیانو تەمەنیدا سودو قازانج بەخەڵکی دەگەیەنێت. ئەگەر پادشایەك ببینێ خێرو خێرات بکات ئەوا دادپەروەری یەکەی هەموو خەڵکی دەگرێتەوە.

**خێمە** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خێمە بۆ خۆی دروست بکات وەیان کەسێك خێمەی بۆ هەڵبدات و لە خێمەکەدا

دانیشت ئەگەر لەشکری بێت بە ئەندازەی بچوکی و گەورەیی ئەو خێمەیە سەروەت و سامان بەدەست دێنێت. وە ئەگەر بازرگان بێت بۆ سەفەر دەڕوات و سەروەت و سامانی زۆر بەدەست دێنێت. ئەگەر خێمەی رەش و گەورە هەڵ بدات دوچاری خەم و پەژارە دەبێتەوە وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خێمەی دڕاو یان کۆنە هەڵبدات زەرەرو زیانی لێدەکەوێ.

**خوم** : لێکدانەوەی خوم لە خەودا ژنێکە کە لەلایەن ئەو ژنەوە بە ئەندازەی چاکی و بەکەڵکی ئەو خومە سود بەو ماڵە دەگەیەنێ.

**خوتبەدان** : ئەگەر کەسێك کەخۆی لایەنگری زانست بێت لە خەویدا بینی بچێتە سەر مینبەر و خوتبە بدات ئەوا عیزەت و گەورەی دەست دەکەوێت. وە ئەگەر لایەنگری خوتبە و مینبەر بێت بەڵگەی ئەوەیە ماوەیەکی دوروو درێژ بۆ سەفەر دەڕوات و ئەگەری دژواری تێدایە بۆی. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی سەرمایەدار بێت لەوانەیە هەژار بکەوێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی نەزان بێت لەوانەیە لە نێوان خەڵکیدا رسوا ببێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ناموسڵمانێك خوتبە بدات بەڵگەی ئەوەیە موسڵمان دەبێت.

**خوری** : بینینی خوری لەخەودا بەهەر شێوەیەك بێت ڕزق و ڕۆزی حەلاڵە. خوری نەڕستراوە چاکترە وە ئەگەر بینیت خوریت هەبێت یان کەسێ پێی دایت یان کڕیت بەو ئەندازەیە سەروەت و سامان بەدەست دێنیت.

**خنكاندن** : ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی كەسێك دەیخنكێنێك بەڵگەی ئەوەیە غەمگین دەبێت.

**خورما** : خورما لەخەودا سەروەت و سامانە، ئەگەربببینێ خورما بخوات زانستی زیاد دەكات ئەگەربازرگان بێت سەروەتی زیاد دەكات ئەگەرخورما بخوات و ناوكەكەی فڕێ بدات یاساكانی دین ئەنجام دەدات وەئەگەر بازرگان بێت لەدووڕوی و ڕیاكاری دووردەكەوێتەوە

**خشت** : لێكدانەوەی بینینی خشت لە خەودا سەروەتی زیادە و كۆكراوەیە هەروەها لێكدانەوەی هەر خشتێك هەزار درهەمە. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی خشت ببڕێت و دروستی بكات وە ئەو خشتەش وشك بویەوە بە ئەندازەی ئەو خشتە سەروەت بەدەست دێنێ. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی خشت بەدەستیەوە بگرێت وەیان كەسێك پێی بدات هەزار درهەم بەدەست دێنێت وە یان كەسێك پێی دەدات. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی خشتێكی زۆری بۆ كۆكرابێتەوە ئەوا سەروەت و سامانی زۆری بۆ كۆ دەبێتەوە.

**خوراندن ( ئاڵۆش )** : ئەگەر كەسێ لە خەویدا لەشی ئاڵۆش بكات ئەوا لە وەزع و ئەحواڵی خزمەكانی ئاگادار دەبێت و لەوانەوە دوچاری غەم و پەژارە دەبێتەوە.

**خەوش و خاڵ ( زبڵ )** : بینینی خۆش و خاڵ لە خەودا بۆ گشت خەڵكی سەروەت و سامانە. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی خۆش و خاڵی بەردەرگاكەیان زۆر بێت وە یان لە نێوان خۆش و خاڵدا نیشتەجێ بوبێ ئەوا بە ئەندازەی ئەو خەوش و خاڵە سەروەت

و سامان بەدەست دێنێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خەوشەخاڵ ( با ) بیبات وە یان ئاگرێك بیسوتێنێ ئەوا پادشا دەست بەسەر سەروەت و سامانەکەیدا دەگرێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خەوش و خاڵەکەی لە ژێر قابلمەیەکدا وە یان تەنورێکدا بسوتێنێ ئەوا سەروەت و سامانەکەی خەرج دەکات.

خۆڵ ( خاك ) : خاك لە خەودا چ کەم بێت یان زۆر پارەو درهەمە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەبەر دەرگایەك خاك و خۆڵ هەبوو بە ئەندازەی ئەو خاك و خۆڵە پارەی بەبێ رەنج و زەحمەت دەست دەکەوێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەسەر خۆڵدا بڕوات ودیان خۆڵ بخوات وەیان خۆڵ کۆبکاتەوە ئەوا سەروەت و سامان کۆ دەکاتەوە.

خۆڵەمێش : خۆڵەمێش لەخەودا سەروەتێکی پڕو پوچی پاشایە کە بۆ هیچ کەس نامێنێتەوە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خۆڵەمێش کۆبکاتەوە و لەناو بچێ بەڵگەی ئەوەیە سەروەتێکی لەلایەن پاشا پێ دەگات بەڵام بەدەستیەوە نامێنێتەوە.

خرقە (پارچە - کەشی صوفیو دەروێش) : ئەگەر کەسێ کەشی پاك و پاکی لەبەرکردبێ لە غەمو پەژارە ڕزگاری دەبێ ئەگەر کەشی ئاوریشمی لەخەودا بینی بۆ کەسێك کە لە کەشی ئاوریشمی لەبەر دەکات چاکە بەڵام بۆ کەسانی پارساو پارێزکار خراپە وە کەشی کەتانی لەخەودا بەڵگەی سودو قازانجەو کەشی خوری بەڵگەی بەهێزی دینە.

## پیتی ( د )

دارستان : بێشەی درەختان ژنێکی بیابانییە، ئەگەر ببینێ بۆ ئەو بێشەیە ڕۆشتن‌و بێشەکەش سەر سەوزبو وە درەختەکان میوەیان پێوە بوو بە تایبەت لە وەرزی میوەدا، ژنێ داوا دەکات ئەسڵ‌و ئەسەبی ئەو ژنە بیابانییە دەبێ وە لەو ژنەشەوە خێرو قازانجی دەست دەکەوێت وە ئەگەر ئەو بێشەیەی بە خاڵی بینی بەڵگەی خراپی‌و زیانە وە ئەگەر ببینێ لەو بێشەیەدا لە جێی درەختی میوە دڕك بوو وە ئەو دڕکانەش بۆ ئەو کەسە گەزندەبوون لە لایەن ژنانەوە دوچاری غەم‌و پەژارەو زیان دەبێت.

دان بەزەویدا : ئەگەر لەخەویدا بینی کەسێکی دا بەزەویدا، بەسەر دوژمندا سەردەکەوێت، وە ئەگەر بینی کەسێك ئەوی بەزەویدا خست دوژمن بەسەر ئەودا زاڵ دەبێت وە گەر بینی بەرد بتەقێنێ بۆ کەسێکی تر قسەیەکی ناخۆش بە کەسێك دەڵێت وە هەندێکیش دەڵێن ئەو کەسە بە تاوانی زینا تاونبار دەگرێت.

دان شتن : ئەگەر لەخەودا ببینێ دان بشوات بەڵگەی ئەوەیە پارە بۆ شتێك خەرج دەکات.

دانیشتن: ئەگەرکەسێ لەخەویدا ببینێ لەسەر زەوی دابنیشێ بەڵگەی ئەوەیە لەسەفەردا سەروەت بەدەست دێنێ وەئەگەر ببینێ لەسەر زەوی دا بخەوێت، لێکدانەوەکەی هەرهەمان لێکدانەوەیە.

داس : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی داسی لەدەستابێت ئەوە ئامێرێك دروست دەکات کەبەهۆیەوە سەروەت بەدەست دێنێ. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەداس دردوبکات بەڵگەی ئەوەیە کە بەرەنج و زەحمەتەوە سەروەت بەدەست دێنێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی داسەکەی بشکێت وەیان ون ببێت ئەوا لە سەروەتی کەم دەبێتەوە و زیان دەبینێ.

داو : بینینی داو لە خەودا بەڵگەی فرت و فێڵە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی قاچی بوو بە داوەوە ئەوا گرفتاری فرت و فێڵ دەبێتەوە، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی قاچی لەداو بویەوە لێکدانەوەکەی پێچەوانەیە.

داخ کردن : لەخەودا داخکردن پەیداکردنی گەنج و سەروەتە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەشی داخ کرابێت بەو ئەندایەیە گەنج و سەروەت پەیدا دەکات وە ئەگەر ئەو سەروەتە لە رێگای خواوە سەرف بکات لە رۆژی دوایی لە ئەشکەنجەی خودایی بەدوور دەبێت بەلام ئەگەر ئەو سەرودتە لە رێگایی خرابی و نارەوایی سەرف بکات دووچاری ئەشکەنجەی خودایی دەبێتەوە.

دانەوێڵەکان : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دانەوێڵەکان رژابنە سەر زەوی ئەوا نرخەکانیان هەرزان دەبێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دانەوێڵەکان لە جێکایەکدا هەڵبگرێت یان لە جەواڵدا هەڵبگرێت نرخەکانیان زیاد دەکەن و گران دەبن.

داخ لە دڵ : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەسەر رێگای خودا داخ لەدڵ بوو بەڵگەی چاکیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی

بۆ کاروباری دونیایی داخ لەدڵ بێت ئەوا دڵ ئەبەستێ بە کاروباری دونیاییەوە و لە خۆی بایی دەبێت و دەربارەی دین بێ ئاگا دەبێت.

دارچینی.: ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دارچینی زۆری هەبێت ئەوا دووچاری خەم و پەژارە دەبێت، وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دارچینی بخوات ئەوا خەم و پەژارەی زیاتر دەبێت.

دارلێدان : کرمانی دەڵێت : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کەسێك دارکاری بکەن و خەڵکی سەیری بکەن ئەوا ئەوکەسە دەبێتە حاکمی گروپێك، وە ئەو ئەگەر ببینێ کەس سەیری نەکات بە پلەو پایەی گەورەیی دەگات بەڵام پشتی لە دینە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی گۆشتی کەسێك بخوات کە کراوە بە دارا ئەوا لە سەروەت و سامانی ئەو کەسەی کە بەسەر خەڵکیدا حاکمە دەخوات بەتایبەت ئەگەر ببینێ نیشانەی پێوەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەداردا هەڵیان واسیبێت وە خوێنی لێ بێت ئەوا توشی گوناهی زۆر دەبێت و غەیبەت دەکات.

دارتاشی ( نجاری ) : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دارتاشی دەکات ئەوکەسە خێرخوازی خەڵکیە بەڵام لە قسەکردندا لەگەڵ خەڵکیدا دووڕووی دەکات.

دەروێشی : لەخەودا لێکدانەوەی دەروێشی و هەژاری چاکترە لە سەروەت و سامان داری بەتایبەتی ئەگەر دەروێشیەکە بۆ دین و دروست کاری بێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بوبێت بە دەروێش و هەژار کەوتبێ ئەوا دروستکار و عاقیبەت خێر دەبێت وە

ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەوڵەمەند بوبێت لێکدانەوەی پێچەوانە دەبێت.

**دەریا** : لەخەودا لێکدانەوەی دەریا پاشایە یان کەسێکی زانایە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەریا رون و ساف بێت ستەم کار و فاسدە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی هەموو ئاوی دەریاکە بخواتەوە ئەوا پاشایەکی زانایە، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ئەندازەیەك لە ئاوی دەریا بخواتەوە بەو ئەندازەیەی کە دەیخواتەوە پلەو پایە بەدەست دێنێ، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بە مەلەکردن لەدەریا بێتە دەرەوە ئەوا لە زەحمەت و ئازاری پاشا رزگاری دەبێت وەیان لە زیندان دەرباز دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەدەریادا رۆ بچێ و بمرێ پاشان ئاوەکە بیهێنێتە سەرەوە ئەوا لەکارەکانی دونیایدا بە ئازار و ئەشکەنجە دووچار دەبێت و لەناو دەچێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەدوورەوە سەیری دەریا بکات و نزیکی ئاوەکە نەبویەوە ئەوا بە ئارەزوەکانی خۆی ناگات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەسەر دەریادا ڕۆیشت و قاچی تەڕ نەبوو ئەوا لە ئاگری دۆزەخ پارێزراو دەبێت و کارەکانی دونیایی ئاسان دەبێت.

**دەست بڕین** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی پاشا یان قازی دەستی ببڕێتەوە ئەوە برایەکی وەیان خوشکێکی دەمرێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی هەردو دەستەکەی ببڕێتەوە ئەوا لە کار و کاسپیەکەیدا دەستەو ئەژنۆ رادەوەستێ. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەدەستێکی دەستەکەی تری ببڕێت ئەوا لە کار و کاسپیەکەیدا

ستەم و بێویژدانی دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەکارد دەستی خۆی ببڕێت ئەوا عاشق دەبێت.

دەست بەند : لەخەودا لێکدانەوەی دەست بەند بۆ ژنان مێردە وە بۆ پیاوان خەم و پەژارەیە. بەڵام ئەگەر ببینێ دەست بەندەکەی زیو بێت خەمەکەی کەمتر دەبێت.

دۆزینەوە : ئەگەر کەسێك لەخەودا شت گەلێك بدۆزێتەوە بەڵام یەك جۆرو یەك ڕەنگ بن بەڵگەی ئەوەیە بۆ حەج دەڕوات، ئەگەر ژمارەی شتەکان (١٠) بێت بەڵگەی ئەوەیە سەروەتی دەست دەکەوێت، ئەگەر ژمارەیان سی بێت، سەرکەوتوو دەبێت، ئەگەر ژمارەی شتەکان هەزار بێت چاکتر دەبێت هەرچەند ژمارەی شتەکان زۆرتربێت لێکدانەوەکەی چاکتر دەبێت. ئەگەر ببینێ لەکێودا کانە ئالتون بدۆزێتەوە، بەڵگەی ئەوەیە لەگەڵ ژنێکی خۆش ڕوودا هاوسەرگیری دەکات.

دوژمن : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی شەڕ لەگەڵ دوژمندا بکات ئەگەر دوژمن زاڵ بوو بەسەریدا دووچاری خەم و کۆسپ دەبێت و پێویستە تۆبە بکات تا لەو بەڵایە رزگاری ببێت.

دەف لێدان : لەخەودا لێکدانەوەی دەف ئەمر بە چاکەی لێدەری دەفەکەیە. ئەگەر کەنیزێك دەف لێ بدات بەڵگەی ئەوەیە کە شتێکی بەناوبانگی پێ دەکات بەڵام ئەگەر لێدەری دەفەکە ئازاد بێت ( بەند نەبێت ) بەڵگەی کارێکی بەناوبانگە. ئەگەر پیاوێکی گەنج دەف لێ بدات بە دوژمنەکەی خۆی فرمانی چاکەکردن دەدات. وە

ئەگەر پیرە پیاوێك دەف لێ بدات فرمان بە چاکەکردن واز لێدێنێ و دەربارەی دروستکاری قسە دەکات.

**دەرمان :** ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەرمان بخوات بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی وە دەرمانەکە چاك بوو بۆی ئەوا ئەوکەسە بەشوێن چاکسازی کردنی دینیەوەیەتی. وە ئەگەر ئەودەرمانە سودمەند نەبوو بۆی ئەوا دین و دروستکاری خۆی لەدەست دەدات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەرمان بۆ خەڵکی دروست بکات ئەوا ڕێبازی خودا و کرداری چاك رەفتار دەکات وە ئەگەر ببینێ دەرمانی وشك وەر بگرێت لە خەم و پەژارە رزگاری دەبێت.

**دورینەوە :** دورینەوەی جلوبەرگ و شتەکانی تر لەخەودا بەڵگەی شەڕ و ناکۆکیە. ئەگەر ببینێ جلوبەرگی خۆی یان خێزانەکەی خۆی یان کڵاو بدورێتەوە ئەوا لەگەڵ کەسێك لە خزمەکانی شەڕ دەکات.

**دەجال :** لەخەودا لێکدانەوەی دەجال پیاوی دووڕوو خراپە کە سەر لە خەڵکی دەشێوێنێ.

**دەبەی رۆن، یان ( هیزە ) :** لێکدانەوەی دەبەی رۆن پیاوی دروستکار و ئەمینە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەبەی رۆنی هەبێت وەیان کەسێ پێی بدات لەگەڵ پیاوێکی ئەمیندا دادەنیشێت و چاو پێکەوتن دەکات و بە ئەندازەی گەورەیی دەبەکە خێر دەبینێ. ئەگەر کەسێك لە خەویدا دەبەی چرچ و لۆچ و کۆنە ببینێ ئەوا لەو پیاوە زەرەر و زیانی پێدەگات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی

دەبەکەی وون ببێ ومیان لەناو بچێت ئەوا لەو پیاوە جیا دەبێتەوە و دانیشتن لەگەڵ ئەو پیاوەدا تەرك دەکات.

دەرزی : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەرزیەکی هەبێت و شتێك بدورێ ئەوا کارەکانی ئاسان دەبێت و پێداویستیەکانی دەستەبەر دەبێت.

دەستکەوت : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەسکەوتێك لە کافران بەدەست بێنێت ئەوا لەوشوێنەدا نرخی کاڵاو شتومەك گران دەبێت.

دەرگا :( قاپی ) : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەرگای کەسێك بشکێ و دەرگاکە ببەن و نەزانێ کە بۆ کوێیان بردوە بەڵگەی ئەوەیە کە خاوەنی ماڵەکە دووچاری خەم و پەژارە دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەرگای ماڵەکەی هەڵکەندرابێ ئەوا لەبەر خێزانەکەی دووچاری نارەحەتی دەبێت و ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەرگای ماڵێك داخرابێت ئەوا خەڵکی ئەوماڵە توشی نارەحەتی دەبن وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەماڵەکەیدا دەرگایەکی بچوك هەبوو ئەوا ئازار و ئەشکەنجە بە ژنەکەی دەگات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەرگای ماڵەکەی گەورەبێت ئەوا وەزعی خێزانەکەی باش دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەرگای ماڵەکەی ئەوەندە گەورەبێت کە هیچ دەرگایەکی بەو ئەندازەیە نەبینیبێت ئەوا گروپێك لەکاتی ئازار و شەرکردنیاندا بەبێ مۆڵەتی ئەو دێنە ماڵەکەیەوە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی تەقەتەق بەدەسکی دەرگایەك بکات و لە دەرگا بدات ئەگەر وەڵامیان دایەوە

ئەوا پاڕانەوەکەی گیرا دەبێت وە ئەگەر بەشوێن گەنج و گەوهەردا بگەڕێت پەیدای دەکات.

**دەرگاوانی بەهەشت ( رزوان )** : لێکدانەوەی دەرگەوان فریشتەی دەرگاوانی بەهەشتە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا دەرگاوانی بەهەشتی بینی لە ئەشکەنجەی خودایی بەدوور دەبێت. ئەگەربینی دەرگاوانی بەهەشت راوەستابێت ئەوا لە دونیا دەردەچێت.

**دەرگاوانی** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەرگاوانی بکات بەڵگەی ئەوەیە کە پێداویستیەکی هەیەو بەهۆی کەسێکی پایەدارەوە دەستەبەری دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەرگاوانی بکات بەڵام دەرگانەبوو ئەوا دەبێتە کەسە نزیکەکانی پادشا. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی پادشا لەسەر کاری دەرگاوانی دەری بکات لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

**دەزو** : بینینی دەزوو لەخەودا سەفەرکردنە ، ئەگەر ببینێ لەخوری دەزوو دروستبکات بەڵگەی ئەوەیە سەفەردەکات و خێردەبینێ ، ئەگەر ببینێ لەپەموو یان لەئاوریشم یان کەتان دەزوو دروست بکات بەڵگەی ئەوەیە کارێکی حەڵاڵ و ڕەوا ئەنجام دەدات . ئەگەرببینێ دەزوو بۆلای جۆلا بەرێ بەڵگەی ئەوەیە سەرگەرمی کارێك دەبێت

**دەرع ( زرێ پۆش )** : لەبەرکردنی دەرع لە خەودا بە ئەندازەی مەحکەمی و چاکی دەرعەکە پشتیوان و پەنایە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کە دەرعی هەبێت ئەوا خۆی و خێزانەکەی لەدەست دوژمنان پارێزراو دەبن. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی

دەرعی لەبەر کردبێ لەشی لە شەڕی دوژمنان پارێزراو دەبێت، وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەگەڵ دەرعەکەدا چەکی تری پێ بێت لە فرت و فێڵی دوو رووەکان و شەڕەکانیان پارێزراو دەبێت.

**دەم** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەمی بەستراببێت و قەپات بوبێت ئەوا ئازار و ئەشکەنجە دەبینێت یان نەخۆش دەبێت یان مردنی نزیك بوەتەوە، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەمی گەورە بوبێت بەشێوەیەك کە خواردنی زۆر بگرێت ئەوا بەو ئەندازەیە سەروەت و بژێوی پەیدا دەکات.

**دەنوك** : ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ وەکو باڵندەکان دەنوکی هەبێت بە ئەندازەی ئەو دەنوکە سەروەتو سامان بەدەست دێنێ. ئەگەر ببینی شەلو یان دال دەنوکی لی بداتو ئازارت پی بگات بەلگەی ئەوەیە زەرەرو زیان دەکاتو لەسەروەتی کەم دەبێتەوە.

**دەهۆڵ لێدان** : دەهۆڵ لێدان لە خەودا هەواڵی ناپەسەندە و درۆی ئاشکرایە و هەموو ئەمانە بە لێدەری دەهۆڵەکەوە بەستراوە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەگەڵ دەهۆڵەکەدا ( نەی ) یش لێبدات و قاچ بکێشێ بە زەوی دا بەلگەی خەم و پەژاردیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خۆی بە تەنهای دەهۆڵ لێ بدات ئەوا قسەی پڕو پوچ و درۆ دەکات وەیان کارێکی ئاشکرا ئەنجام دەدات.

**دەلاڵی کردن** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دەلاڵی دەکرد ئەوا دروستکار و خێرخواز و رێنماکاری خەلکی دەبێت.

**دەسکی دەرگا** : ئەگەر خاوەنی ماڵ ببینێ دەسکی زەردی دەرگا یان دەسکی سەروی قاپییەکەی تازە بویەوە مانای ئەوەیە ژنەکەی

تەلاق دەدات‌و ژنێکی تر دێنێت وە ئەگەر ببینێ دەسکی سەردووەی لێ بێتەوە مانای ئەوەیە خۆی ماندو دەکات وە ئەگەر بینی هەردولای قاپییەکە لێ بکاتەوەو خراپی بکات ژن‌و پیاوی ئەو ماڵە ماندو دەبن.
ئەگەر بینی دەسکی دەرگای خانوەکەی بەرزو بڵند بێتەوە بە ئەندازەی ئەوە سامان‌و شەرەف‌و پلەوپایەی بەرز دەبێتەوە وە ئەگەر بینی قاپییەکەی ڕۆبچێ پلەوپایەی نزم دەبێتەوەو لەبەرچاو خەڵکی سوك دەبێت وە ئەگەر ببینێ لە قاپی خانوەکەیدا ئاوێکی زوڵاڵ وەکو باران ببارێ بە ئەندازەی ئەوە سامان‌و خێروبێری دەست دەکەوێت وە ئەگەر ببینێ لە قاپی خانوەکەیدا مارو دوپشك بکەونە خواردوە لەلایەن پادشاوە وەیان کەسێکی ترەوە ئەشکەنجەو ئازاری بۆدێت.

ددان. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ددانی پێشەوەی کەوتە لەپی دەستی وەیان سەرزەوی بەڵام تۆزاوی نەبوو ئەوا منداڵی دەبێت وە یان خوشك و برای دەبێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ددانی پێشەوەی بکەوێت و بکەوێتە سەر زەوی و ون ببێت یەکێك لەوکەسانەی دەمرێت وە یان لێی جیادەبنەوە بەشێوەیەك کە هیچ کەس هەواڵی نەزانن. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی هەندێك لە ددانەکانی بشکێن وە یان لەناو بچن بەڵگەی ئەوەیە بەڵاو کۆسپ توشی یەکێك لەو کەسانە دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ددانی پێشەوەی ئازاری ببێت وەیان زەربەیەك بخوات لەگەڵ یەکێك لەوکەسانە دوژمنایەتی دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی یەکێك لە ددانەکانی پێشەوەی داکەوتبێ ئەوا قسەیەکی ناشیرین بە یەکێك لەو کەسانە دەڵێ و لێی دوور دەکەوێتەوە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ددانەکانی پێشەوەی زۆر ببن وەیان چاك و خاوێن ببن

ئەوا شادی و کامەرانی دەگات بەیەکێك لەو کەسانە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەلای ددانەکانی پێشەوەی ددانی تر دەربکات بەومەرجەی لەڕیزی سەرەوە بێت ئەوا کوڕێکی دەبێت یان برایەك وە ئەگەر لە ڕیزی خوارەوەبێت ئەوا کچێکی دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی هەموو ددانەکانی بکەونە لەپی دەستی وەیان بکەونە نزیکی خۆی ئەوا تاکەکانی خێزانەکەی زیاد دەکات وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی هەموو ددانەکانی هەڵوەرین و لەناو خۆڵ ون ببن ئەوا گروپێك لە خێزانەکەی دەمرێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ددانەکانی لەشوشە یان زیوە ئەوا مردنی نزیکە.

دڕك : دڕك لە خەودا قەرزاریە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دڕك بچەقێ بە لەشیدا وەیان کەسێ دڕك بچەقێنێ بە لەشیدا ئەوا لەکەسێك قەرز دەکات بە ئەندازەی ئێش و ئازاری ئەو دڕکە قسەی ناخۆش لەو کەسە دەبیسێت. ئەگەر بینی دڕکی کرد بە کەسێکدا قەرز دەدات و قسەی ناخۆش و تاڵ دەکات.

دوپشك : بینینی دوپشك لەخەودا دوژمنێکی لاوازە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دوپشك پێوەیەوە بدات دوژمن قسەی تاڵ و ناشیرینی پێدەڵێت و غەمگین دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دوپشکێك بکوژێ بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێت.

دوژمنایەتی ( بەربەرەکانێ ) : کرمانی دەڵێ : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەگەڵ حاکمی ئەو شوێنەدا بەربەرەکانێ بکات و زاڵ ببێ بەسەریدا لەلایەن ئەو حاکمەوە سود و قازانجی پێ دەگات. وە ئەگەر پێچەوانەی ئەوە ببینێت لەلایەن حاکمەوە زیان و

رمنجی پێ دەگات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی پادشا بەربەرەکانێ و رق و کینی کرد ئەوا پێداویستیەکانی دەستەبەر دەبێت.

**درەختی ئابنوس :** بەلگەی پیاوێکە کە لە کارەکانی دەستە پاچە بێت وە هەندێکیش دەڵێن لێکدانەوەکەی ژن یان کەنیزەکە.

**درەختی ئالو ( میوەیەکە لە هەڵوژە دەچێت ) :** بەلگەی پزیشکی و دکتۆریە کە سودەکەی بە هەمووان دەگات. درەختی ئالوی زەرد بەلگەی نەخۆشیە.

**درەختی هەنار :** بەلگەی پیاوێکە کە سەروەت و سامانی زۆری لەبەردەستدابێت وە هەندێکیش دەڵێن بەلگەی ژنێکی شایستەدار و دەوڵەمەندە.

**درەختی هەنجیر :** بەلگەی پیاوی دەوڵەمەندە.

**درەختی ترێ ( مێو ).** : بەلگەی ژنی رووخۆش و چاکە خوازە.

**درەختی بادام :** : بەلگەی ژنی گوناه کار و بەدکارە.

**درەختی بەرو :** بەلگەی پیاوێکی بێ خێر و بێ کەلکە کە لەگەڵ خێزانەکەیدا بە دوو روویی هەڵسو کەوت دەکات.

**درەختی فستەق ( بستە ) :** بەلگەی پیاوێکی دەوڵەمەندە بەلأم چەکل و بەغیل.

**درەختی چنار :** بەلگەی پیاوێکی خۆش ناو و خۆش بەختە کە سود و قازانجی هەیە بۆ خەلکی.

**درەختی خورما :** بەلگەی پیاوی زانا و پاك داوێنە. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دارخورما لەبەر دەرگاکەیدا رواوە لەگەڵ ئەوجۆرەپیاوەدا دادەنیشێ و دەبێتە هاوڕێ.

**درەختی هەڵوژە زەردە ( هەڵوژە گەورە ) :** بەلگەی پیاوی نەخۆشە.

**درەختی زەیتون :** بەلگەی پیاوێکی نەسەب دارە و ئەسڵە کە سەروەت و دارایییەکەی هەندێکە و کەمتر لەگەڵ خەلکیدا چاکە دەکات.

**درەختی سەرو ( شجرالنبق ) :** درەختێکی گەرمەسێرییە نزیکەی سێ هەزار ساڵ تەمەن دەکات بەرزیەکەی نزیکەی ٤٠ مەتر دەبێت. بەلگەی پیاوی بەشەرەف و بە حەیایە.

**درەختی گوێزی هندی :** بەلگەی پیاوی خۆش حاڵ و بە وورە و خۆش رەفتار و سامان دارە.

**درەختی سێو :** لەخەودا لێکدانەوەی درەختی سێو وەك و درەختی ( سەرو ) ە.

**درەختی قۆخ :** بەلگەی پیاوێکی بە توانایە کە بە نەرمی رەفتار لەگەڵ خەلکیدا دەکات.

**درەختی سنەوبەر :** بەلگەی سۆفی و دەروێشە کە بێ دین بێت نە خێری دنیاو نە خێری ئاخیرەت دەبینێ.

**درەختی عەرعەر :** ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی درەختی عەرعەری هەبێ لەگەڵ پیاوێکی ئەسڵ زادەدا دەبێتە هاوڕێ کە ئەوپیاوە کەمتر بەکارە چاکەکانەوە خەریك دەبێت.

**درەختی عود :** بەلگەی پیاوێکی جوان و بە توانایە.

**درەختی فندق:** بەلگەی پیاوێکی عەرەب و دڵ رەقە و خێری بۆ خەڵکی کەمە.

**درەختی گوێز :** بەلگەی پیاوی فارسە کەلەگەڵ خێزانەکەیدا بە چاکی و میهرەبانیەوە رەفتار دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بۆ سەر دارگوێزێك سەرکەوتو بێت لەگەڵ ئەو جۆرە پیاوەدا دەبێتە هاوڕێ.

**درەختی هەرمێ :** بەلگەی پیاوێکی خۆش کردار و سەروەت مەندە.

**درەختی مورد :** حەزرەتی صادق ( ع ) دەفەرمێ : لەخەودا لێکدانەوەی درەختی مورد چوار لایەنی هەیە.

١ - کرێکاری رۆژانە. ٢ - منداڵی چاك و رەفتار جوان. ٣ سەروەتی زۆر. ٤ - سود و قازانج.

**درەختی نارگیل :** بەلگەی پیاوێکی جادوگەر و درۆزنە.

**درەختی نارنج :** بەلگەی پیاوێکی رەنگ زەرد و نەخۆشە.

**درەختی نەی :** بەلگەی پیاوی بەدنەخلاق و تەڵەکە بازە.

**درۆ :** لەخەودا لێکدانەوەی درۆکردن فەساد و خراپی دینە، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی شەهادەتی درۆ بدات دینەکەی لەناو دەچێ. وە بەگشتی لێکدانەوەی درۆ لە خەودا چاك نیە.

**دڵ :** لەخەودا لێکدانەوەی بینینی سامانێکە کە پێی دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دڵی لەدەرەوەی لەشیدا بێت ئەوا

بەلگەی سەلامەتی لەشیەتی. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دلتەنگ بێت ئەوا کارەکان سەخت و دژوار دەبن بۆی. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دلخۆش و شاد بێت ئەوا کارەکان سانا و ئاسان دەبن بۆی. ئەگەر بینی دلی گیرابێت پێویستە لە گوناهەکانی تەوبە بکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دلی کەوتبێتە لای راستیەوە ئەوا نەخۆشیەکی دژوار دەگرێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بە هەردوو دەستی دلی گرتبێت ئەوا کارەکانی ئەنجام دەدات.

دومەڵ : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دومەلی هەبێت بە ئەندازەی ئەو دومەلە سەروەتی زیاد دەکات . ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دومەلی بتەقێ و خوێنی لێهات ئەوا بەشێکی سەروەتەکەی لەناو دەچێت.

دوگ : لەخەودا لێکدانەوەی دوگ بەلگەی کیسەیەك پارەیە کە پیاو هەلی دەگرێت وەیان سەرودتی ژنە، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دوگی کاڵ بخوات ئەوا سامانی بەگومانی هەیە وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دوگی کولاو بخوات ئەوا دوژمن لە سەروەتەکەی دەخوات.

دورین : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەرگی خۆی دوریبێت کارەکانی بەرەو پێش دەڕوات وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەرگێك لە مالەکەی خۆی بدورێت لێکدانەوەکەی هەر هەمان شتە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەرگی ژنێك بدورێت ئەوا خەم و پەژارەی پێدەگات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەرگی پیاوێك بدورێ ئەوا لێکدانەوەکەی چاکە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا

بینی دەرزی بەدەستیەوە بێت و بەرگەکە تەواو نەدوورێت بەڵگەی ئەوەیە کە هەرکارێك بکاتە پیشەی خۆی تەواوی ناکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کە بەرگی دووراوی زۆری لەماڵەکەیدا هەبێت ئەوا خۆشی و کامەرانی ژیانی زیاد دەکات و سەروەتێك لە ئیرسەوە بەدەستی دەکات.

**دوکەڵ :** دوکەڵ لەخەودا پاشایەکی زۆردار و ستەم کارە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە ڕۆژهەلآت و ڕۆژئاوای جێگایەك دوکەڵ بەرز ببێتەوە ئەوا خەڵکی ئەو سەرزەمینە دووچاری زوڵم و ستەمی پاشایەك دەبنەوە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەهەموو جێگایەك دوکەڵ بەرز ببێتەوە و ئاگرەکەش بڵێسەدار بێت ئەوا خەڵکی ئەو سەرزەمینە دووچاری فیتنە و بەلآ و ئەشکەنجە دەبن.

**دۆزەخ :** ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بۆ دۆزەخ بڕوات و نەیەتە دەرەوە بەڵگەی ئەوەیە دەبێتە گوناه کار و بەدکار وە پێویستە تەوبە بکات بەرەو لای خوای گەورە بگەڕێتەوە چونکە مەرگی نزیك بوبێتەوە و لەوانەیە بەکافری لە دونیا دەربچێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا دۆزەخی بینی بەلآم ئازار و ئەشکەنجەی پێ نەگات بەڵگەی ئەوەیە دوچارە ئازارو ئەشکەنجەی دونیا دەبێت بەلآم سەرئەنجام رزگاری دەبێت. ئەگەر بچێتە دۆزەخەوە بەلآم نەزانێ چکات چوەتە ناوی ئەوا هەمیشە لەدونیادا دوچاری گرفتار و پەشێوی دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە دۆزەخدا خواردن و خواردنەوە بخوات و لە ئاگردا بسوتێ بەڵگەی ئەوەیە کە لە دونیادا بەدکارەو لە رۆژی کۆتایدا سزای دەدرێت. ئەگەر کەسێك

له خەویدا بینی فریشتەیەك بە قژ هەڵی بگرێت و فرێی بداتە دۆزەخەوە ئەوا بینەری خەوەکە دووچاری بەد بەختی دەبێت.

دینار : ئەگەر کەسێك پێنج دیناری لە خەویدا بینی بەڵگەی ئەوەیە کاری پەسەندانە ئەنجام دەدات. ئەگەر یەك دیناری گەورە نەك بچوك ببینێ ئەوا دەبێتە خاوەنی خانویەکی بچوك بەتایبەت ئەگەر کەسێکی ناشنا پێی بدات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی هەزار دینار یان سەد دیناری هەبێ ئەوا زانستێك فێر دەبێت بەومەرجەی ژمارەی دینارەکان جوت بێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دینار بەیەکێك بدات وە یان ونی بکات بە ئەندازەی دینارەکە زانست و زانیاری لەدەست دەدات.

دیلانێ : تەعبیری دیلانێ لەخەودا خزمەتکاری ماڵە ئەوەی کە خاوەن ماڵ هەیەتی بەسەر هاوسەرو ئەندامانی ماڵدا سەرفی دەکات ئەگەر ببینێ کە دیلانێیەکی تازەی هەبێ یان کەسێ پێی بدات خزمەتکارێکی ساڵحو چاکی دەست دەکەوێت وە یان لێی جیا دەبێتەوە.

دیوار : لەخەودا لێکدانەوەی دیوار بینین بەڵگەی وەزع و حاڵی ژیانی بینەری خەوەکەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەسەر دیوارێکی قایمدا دابنیشێت ئەوا حاڵ و وەزعی لەژیاندا باش و توند و تۆڵ دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دیوارێکی کۆنە تێك بدات ئەوا سەروەت بەدەست دێنێت بەلاّم ئەگەر دیوارەکە تازەبوو ئەوا بەڵگەی خەم و پەژارەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەسەر دیوار راوەستاوە ئەوا وەز ع و حاڵی چاك نابێت بەرەو

پێش ناڕوات وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەسەر دیوار کەوتە خوارەوە ئەوا وەزع و کارەکانی شیرازەی تێك دەچێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بە دیواردا هەڵواسراوە ئەوا پەشێو و پەرێشان حاڵ دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی دیوارێك لەجێگەی خۆی بەرز بکاتەوە ئەوا پیاوێك بە پلەو پایە دەگەیەنێ. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی فڕێ بدات ئەوا کارێك لەسەر کارو کاسپی دەردەکات.

**دۆشاوەکان** : دۆشاوەکان هەرکامیان شیرین و خۆش بۆ بێت بەڵگەی سود و قازانجە وە ئەگەر شیرین و خۆش بۆ نەبێت ئەوا دوچاری خەم و پەژارەو بەلا دەبێتەوە. کولانی دۆشاوی شیرین بەڵگەی کار و سودە وە ئەگەر ترش بێت لێکدانەوەکەی پێچەوانەیە.

**دۆشەك** : بینینی دۆشەك لەخەودا ژنە، وە چاکیو خراپییەکەی بە ژنەکەوە بەندە، ئەگەر ببینێ دۆشەکەیەك بکڕێت یان بیگۆڕێت یان لەم دۆشەکەوە بۆ دۆشەکەیەکی تر بڕوات ژنێکی تر دێنێ وە ژنی یەکەمی تەلاق دەدات، وە گەر ببینێ خەوی دۆشەکەکەی گۆڕاوە حاڵو ئەحواڵی ژنەکەی دەگۆڕێ.

# پیتی ( ر )

ران : لێکدانەوەی رانی ڕاست لەخەودا کوڕە، ڕانی چەپ لەخەودا کچە، ئەگەر کەسێ لەخەویدا ڕانی توندو تۆڵو بەهێزبێت منداڵەکەی سالمو لەش ساغ دەبێت بەلام ئەگەر ڕانی لاوازو بێ هێزبێت لێکدانەوەکەی پێچەوانەیە.

رازیانە : لەخەودا لێکدانەوەی رازیانە چ لە وەرزی خۆیدا بێت و چ لە وەرزی تردا بەڵگەی خەم و پەژارەیە و خواردنی بەڵگەی ئازار و ئەشکەنجەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە شوێنێکدا کە مەملەکەتی خۆیەتی رازیانەی زۆری هەبێت ئەو دوچاری خەم و پەژارە دەبێت.

رەقس کردن ( هەڵپەڕین ) : هەڵپەڕکێ و پێ کێشان بەزەویدا خەم و پەژارەیە.

رەگ بڕین : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی پیاوێکی پیر رەگی ببڕێت بەڵگەی ئەوەیە کە لەلایەن دوژمنەوە قسەیەك یان تانەیەك دەبیسێ یان سەروەتی لەناو دەچێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی رەگی ببڕێت و خوێنی لێ بێت ئەوا لەلایەن پاشاوە پەژارەی پێ دەگات و بەئەندازەی ئەو خوێنە زیانی پێ دەکەوێت.

رەنگی سپی : رەنگی سپی لە جلوبەرگ و لەو باتەتانە بەڵگەی دروستکاری و راستی دیانەتە.

رەنگی سور : بۆ پیاوان ئازار و ئەشکەنجەیە بۆ ژنان چاکەیە.

ڕەنگی سەوز : لە جلوبەرگ و شتەکانی تردا بۆ ژنان و پیاوان بەڵگەی خێرو چاکەی کاروباری دین و دنیایە.

ڕەنگی زەرد : بۆ ژنان و پیاوان بەڵگەی نەخۆشیە.

ڕەنگی ڕەش : ڕەنگی ڕەش بۆ جلوبەرگی ژنان و پیاوان نیشانەی ناڕەحەتیە بەڵام بۆ کەسانی کە هەمیشە ڕەش پۆشن زیانی نییە.

ڕەنگی کەوێ : لە جلوبەرگدا بۆ ژنان و بۆ پیاوان بەڵگەی خەم و پەژارەیە.

ڕەحەتی : لێکدانەوەی ڕەحەتی لەخەودا کەنیزەك یان خزمەتکارە، ئەگەر لە خەویدا ژمارەیەك ڕەحەتی هەبو بەڵگەی ئەوەیە نۆکەر یان کەنیزەك دەکڕێت، ئەگەر ببینێ ڕەحەتییەکی وون ببێت بەڵگەی ئەوەیە لە نۆکەرەکەی یان کەنیزەکەی جیا دەبێتەوە.

ڕق و کین : ئەگەر لەخەودا ڕق و کینی لە ستەمکارێك بێت بەڵگەی ئەوەیە زاڵ دەبێت بەسەر ئەو ستەمکارەدا هەندێکیش دەڵێن لێکدانەوەکەی پێچەوانەی ئەوەیە.

ڕێگا : بینینی ڕێگە لەخەودا بەڵگەی گەڕانە بەشوێن دین و باوەڕ و دروستکاری دونیایە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەشارێکدا بڕوات ئەوا لە ڕێگای دین و پەروەردگاردا هەنگاو دەنێ، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کۆمەڵێك بۆ سەر ڕێگای ڕست ڕێنمونی بکات بەڵگەی ئەوەیە کۆمەڵێك بۆ سەر ڕێگای ڕاست

ڕێنمونی دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەرێگایەکدا ون ببێت ئەوا لە کاروباری دین و دنیادا سەرگەردان دەبێت.

ڕشانەوە : ئەگەر کەسێ ببینێ دەرشێتەوەو خوێن هەڵدێنێتەوە زەرەر دەکات (دانیاڵ) (ع) ئەڵێ : ئەگەر ببینێ ڕشایەوەو بە ئاسانی فرێیدایە دەرەوە لەسەرپێچیو گوناهەکان تۆبە دەکات وە ئەگەر نەیتوانی فرێی بداتە دەرەوە زیانێك بەو کەسە دەگات هەندێکیش دەڵێن بەڵگەی ئازارو زیانی سامانە.

ڕێوی : لەخەودا لێکدانەوەی ڕێوی پیاوی حیلەگەر و فێڵ بازە وە یان ژن و کەنیزەکی درۆزن خزمی بینەری خەوەکەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەگەڵ ڕێویدا شەڕ بکات خزمەکانی لەگەڵیدا شەڕ و ناکۆکی دەکەن، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەدوای ڕێویدا بگەڕێت ئەوا لە پەری دەترسێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەگەڵ ڕێویدا یاری بکات ئەوا ژنێك خۆشی دەوێت بەلام خۆشەویستیەکەی لاوازە.

ڕۆژ هەڵهاتن : لێکدانەوەی ڕۆژ هەڵ هاتن لەخەودا پاشاکانی دنیان، ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ ڕۆژ هەڵبێت بەڵگەی ئەوەیە ئارەزووەکانی بەدی دێنو لێکدانەوەی ڕۆژ ئاوابون پێچەوانەیە، ئەگەر ڕۆژهەلات لەجێگەی خۆیدا ببینێ بەڵگەی ئەوەیە بە ئارەزووەکانی دەگات بەلام ئەگەر لەجێگەی خراپدا بێت لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

ڕۆیشتن : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەشار و شوێنی خۆی بۆ دەرەوە بڕوات و نەزانێ بۆ کوێ بڕوات ئەوە بەڵگەی ئەوەیە

بێچارە و سەرگەردان دەبێت وە ئەگەر لەگەڵ ژن و منداڵەکانیدا بڕوات ئەوا هەموویان سەرگەردان دەبن. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی وەك و حوشتر بڕوات ئەوا کامەران دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی وەك و ئەسپ یان کەر بڕوات ئەوا تەمەن درێژ دەبێت بەڵام هەژار دەکەوێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی وەکو ئاژەڵە کێویەکان بڕوات ئەوا لێکدانەوەکەی خراپە بەتایبەت لە بواری دینیدا. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی وەك و باڵندە شاکارەکان بڕوات لێکدانەوەکەی هەر وا دەبێت بەڵام ئەگەر وەك و باڵندەکانی تر بڕوات بەڵگەی خێر و بەرەکەتە.

ریکاب : ( ئەو ئەڵقە ئاسنینەیە کە بە زینی ئەسپ و ماینەدا بۆ سواربوون هەڵواسراوە ) : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کە ریکاب لە زین لێ بوبێتەوە بەڵگەی منداڵ یان نۆکەرە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی رێکاب لەگەڵ زیندا بوو ئەوا منداڵێکی چاك و رەوشت بەرز پەیدا دەکات کە هیچ خیانەتێکی تیا بەدی ناکات.

رۆشنایی ( روناکی ) : لەخەودا لێکدانەوەی روناکی هیوایەتی دینی خودایە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی رۆشنایەکەی زیادی کرد وە یان کەسێ پێی ببەخشێ ئەوا کەسێك فێری زانستی دینی دەکات. وە تاریکی لە خەودا نەزانی و نەفامیە لە دیندا.

ریخۆڵە : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ریخۆڵەیەك بەدەستیەوە بگرێت وە یان کەسێك پێی بدات ئەوا لەلایەن کەس و خزمە نزیکەکانیەوە سودو قازانجی پێدەگات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ریخۆڵەکانی لەناو سی بێنە دەرەوە ئەوا منداڵێکی

خزمەکانی دەبێتە گەورە یان سەرۆك. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ڕیخۆڵەی کەسێك بخوات بەئەندازەی خواردنەکەی سەروەتی شاراوەی کەسێك بەدەست دێنێ.

رووتو قوتی : گە کەسێ لەخەویدا ببینێ ڕووتو قوتەو شەرم لەخەڵکی بکاتو بیەوێت خۆی بە شتێك داپۆشێ لە بیرکردنەوەی حەجدایە، وە ئەگەر بینەری خەوەکە پیاوێکی چاكو پاكو بێ گەردبێت پیرۆزتر دەبێت، وە ئەگەر پیاوێکی خراپکار بێت پێچەوانەی ئەوەیە.

رۆژو : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ڕۆژو بگرێت و قورئان بخوێنێت وە یان تەزبیحاتی خوای گەورە بکات بەڵگەی ئەوەیە کە لە حەرام خواردن و کوفرکردن تەوبە دەکات. ئەگەر ببینێ بە زمانی ڕۆژووەوە غەیبەتی خەڵکی یان قسەی ناپەسەند بکات بەڵگەی ئەوەیە بە درۆ و ریاکارانە بەندایەتی دەکات و لە ڕێگای دین ڕاستگۆ نیە.

رۆژەکان : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ڕۆژی هەینی یان شەممەیە ئەوا کارێك دەست پێدەکات کە وائەزانێ خێرە بەلاّم کارێکی خراپەیە وە ئەگەر لە خەودابوو وابزانێ شەوە بەلاّم ڕۆژ بوو ئەوا بەکاری چاکە و چاکە خوازی دەکات.

رۆن : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی هەموو لەشی ڕۆناوی بوبێت ئەوا نەخۆش دەکەوێت، وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی رۆن لەسەری بدات ئەوا جوانیەکانی دونیای دەست دەکەوێت. ئەگەر ڕۆنە بۆن خۆشەکانی وەك گوڵ و ڕۆنی یاسەمین و وەنەوشە ببینێ

لێكدانەوەكەی هەر وا دەبێت. ئەگەر كەسێك لە خەویدا رۆنی ناپەسەند و بۆن ناخۆشی بینی ئەوا خەڵكی بە خراپە باسی دەكەن.

رشتن : ڕشتنی پارچەو جل‌وبەرگ لەخەودا گەست كردنە، ئەگەر ببینی شتێك ئەچنی بۆ شوێنێك دەچیت.

ریش : لەخەودا لێكدانەوەی ریش ئارامی و جوانی پیاوان و زاوایە. ئەگەر كەسێك لە خەویدا ببینێ ریشی درێژ بێت بەلأم گونجاو لەباربێت ئەوا كاری ژیانی و زاوایەتی بە زووی بە ئەنجام دەگەیەنێ. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی درێژی ریشی تا ناوكی ببێت ئەوا دوچاری خەم و پەژارە دەبێت. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی ریشی خۆی بە مەقەست یان نینۆك ئارایشت بكات ئەوا بەڵگەی ئەوەیە لە كاروباری مێردایەتی و ناوماڵدا ئاگادارە. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی ریشی خۆی رەنگ بكات بەلأم رەنگ نەگرێت ئەوا وەزع و حاڵی خۆی لە خەڵكی ناشارێتەوە. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی ریشی لەسەر زەوی بخشێت ئەوا مەرگی نزیكە. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی هەموو ریشی لاببات بەڵگەی ئەوەیە زیانێكی لێدەكەوێت و پلەو رێزی كەم دەبێتەوە.

رێحانە : ئەگەر كەسێك لە خەویدا رێحانەی سەوز و تازە و بۆن خۆش ببینێ بەڵگەی ئەوەیە منداڵی دەبێت. وە ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی رێحانە لە زەوی هەڵبكێشێ دوچاری خەم و پەژارە دەبێت.

ریخ : لەخەودا لێكدانەوەی ریخ سەروەت و قازانجە. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی بەناو ریخدا بڕوات ئەوا بە ئەندازەی ئەو

ریخە بۆ دابینکردنی ژیانی سەرگەرمی کار دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ریخ بخوات یان کۆی بکاتەوە بەو ئەندازەیە سەروەتی بۆ کۆدەبێتەوە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ریخ بەکەسێك بدات ئەوا بەو ئەندازەیە سود بەو کەسە دەگەیەنێ.

رێواس : لەخەودا لێکدانەوەی رێواس خەم و پەژارەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی رێواس بخوات، بەوئەندازەیە خەم و پەژارە دەخوات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی رێواس بفرۆشێت یان بەکەسێکی بدات ئەوا لە خەم و پەژارە رزگاری دەبێت.

روخسار : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی روخساری جوانتر بێت لەوەی خۆی ئەوا پلەو پایەی بەرزتر دەبێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی روخساری ناشیرین بوبێت ئەوا لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

## پیتی ( ز )

زانا : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بوبێ بە فەقێ یان زانا، ئەگەر کەسەکە کەسێکی نەفام و نەزان بێت ئەوا لەنێو خەڵکیدا بەدناو دەبێت وە ئەگەر زانایەك ئەو خەوە ببینێ ئەوا زانستەکەی زیاد دەکات.

زاڵ بوون : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەسەر دوژمندا زاڵ ببێت ئەوا بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێت وە ئەگەر پێچەوانەکەی ببینێ ئەوا لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

زالو : لەخەودا لێکدانەوەی زالو دوژمنی تەماع کارە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زالو لەلەشی خوێن بمژێت ئەوا دوژمن بەسەریدا زاڵ دەبێت و بە ئەندازەی خوێنەکە لە سەروەتی کەم دەبێتەوە، ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زالوی کوشت و لەخۆی دورخستەوە بەسەرّ دوژمندا زاڵ دەبێت.

زەکەر ( ئەندامی پیاوەتی ) : گەورەیی زەکەر لەخەودا بەڵگەی خۆشی منداڵ و گەورەیی و ناوبانگە وە بچوکی زەکەر بەڵگەی بچوکی و بێ ناونیشانە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زەکەری کۆمەڵە زەکەرێکی تری وەك درەخت لێ بڕوێت بەڵگەی زۆربوونی منداڵیەتی. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەزەکەری ماسی بێتە دەرەوە ئەوا کچی دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەزەکەری پشیلەیەك بێتە دەرەوە کوڕێکی دز و چەتەی دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە زەکەری مریشکێك بێتە دەرەوە

ئەوا لێکدانەوەکەی پەیوەندی بە جۆری مریشکەکەوەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەزەکەری مشکێك بێتە دەرەوە ئەوا کچێکی دەبێت کە هیچ خێرێکی بۆ ناداتەوە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەزەکەری مار بێتە دەرەوە منداڵێکی دەبێت کە بۆی دەبێتە دوژمنی. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەزەکەری دوپشکێك بێتە دەرەوە ئەوا هەمان لێکدانەوەی هەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەزەکەری کرم و مێروله بێتە دەرەوە بەلگەی ئەوا منداڵەکەی خراپ و پڕو پوچ دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەزەکەریەوە نان بێتە دەرەوە ئەوا هەژار و تەنگ دەست دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەزەکەری کونجی بێتە دەرەوە ئەوا ژنەکەی بە دزیەوە حەز لەیەکێکی تر دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەزەکەری خوێن بێتە دەرەوە ئەوا لەکاتی حەیز ( بێنوێژی ) دا جیماع دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کرم و جەراعەت لە زەکەری بێتە دەرەوە ئەوا منداڵی کەم ئەندامی ئەبێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ئاوی پاك لەزەکەری هاتە دەرەوە ئەوا منداڵی پارساو رەفتار جوانی دەبێت بەلاَم ئەگەر ئاوەکە لێڵ بوو ئەوا لێکدانەوەکە پێچەوانە دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەزەکەری ( مەنی ) بێتە دەرەوە ئەوا بەو ئەندازەیە سەروەت و سامان پەیدا دەکات. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ئاگر لە زەکەری بێتە دەرەوە نیوەی بۆ رۆژهەلاَت بڕوات وە نیوەکەی تری بۆ رۆژئاوا ئەوا منداڵێکی دەبێت وەکو ئەسکەندەر پاشا رۆژهەلاَت و رۆژئاوا داگیردەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەزەکەری

چوارپێ و پیسی هاتە دەرەوە بەڵگەی ئەومیە حەزی لە کارێکی خراپە وەکو نێربازی .

زەنـگ.زەنگـی کلێـسا : لێکدانـەوەی زەنـگ لەخـەودا کەسـێکی دوورووە، ئەگەربیبینێ زەنگ لێ بدات بەڵگەی ئەومیە لەگەڵ کەسـێکی دوورودا هـەڵس و کـەوت دەکـات درۆدەکـات ئەگـەربیبینێ زەنگەکـە بشکێت بەڵگەی ئەوەیە تۆبە دەکات لەدرۆ کردن

زمان : زمان لە خەودا ئاشکراکردنی نیەتی خاوەن زمانەکەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەبێ ئەوەی شەڕو ئاکۆکی لەگەڵ هیچ کەسێکدا ببێت زمانی ببڕن بەڵگەی ئەومیە کاتی بەرگری کردن لە خۆی زمانی دەبەسترێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی پانی و درێژی زمانی زیادی کرد ئەوا لەکاتی شەڕو بەرگری کردندا زمانی پاراو دەبێت و بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێ.

زەردئـاڵو : ئەگەرکەسـێ لەخەویـدا زەرد ئـاڵو بخـوات وەئەگـەر زەرد ئاڵووەکـە شـیرین بێـت و لـەوەرزی خویـدا بێـت بەئەنـدازەی ئـەوزەردئاڵوەی کـەدەی خـوات پـارەو ئـاڵتونی دەسـت دەکـەوێت بـەڵام ئەگەر ترش بوو دووچاری خەم و پەژارەدەبێتەوە.

زەردەچەوە : بینینی زەردەچەوە لەخەودا بەڵگەی ئەخۆشی و ئازارە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی خەرمانێك زەردەچەوەی هەبێ ئەوا زەرەرو زیانی پێدەگات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی جلوبەرگی خۆی بە زەردەچەوە رەنگ بکات ئەخۆش دەکەوێت وە ئەگەر جلوبەرگەکە هی کەسێکی تربێت ئەوا خاوەن جلوبەرگەکە

نەخۆش دەكەوێت. وە بەگشتی زەردەچەوە لە خەودا هیچ سودو قازانجێكی تێدا نیە.

**زەرنیخ :** بینینی زەرنیخ لە خەودا بەلگەی نەخۆشی و ئازارە. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی زەرنیخ بخوات نەخۆش دەكەوێت. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی زەرنیخ بفرۆشێت وەیان بیدات بەكەسێك وەیان ونی بكات ئەوا لە خەم و پەژارە دوور دەكەوێتەوە.

**زەعفەران :** ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی زەعفەرانی پێبێت بەلگەی ئەوەیە بە ئەندازەی زەعفەرانەكە خەلكی باسی بە چاكە دەكەن و سوپاسی دەكەن بەتایبەت ئەگەر زەعفەرانەكە كوتراو بێت. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی زەعفەران بكوتێ یان بیهاڕێ ئەوا نەخۆش دەكەوێت. وە ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی رەنگی زەعفەران بچێت لە جلوبەرگەكەیەوە ئەوا نەخۆش دەكەوێت وە ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی رەنگی زەعفەران لە جلوبەرگەكەی لێبكاتەوە ئەوا لە نەخۆشی رزگاری دەبێت.

**زەكات :** ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی زەكاتی سەروەتی بدات ئەوا سەروەتی زیاد دەكات. ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی زەكاتی سەرفیترە بدات ئەوا زیكری خوا دەكات و نوێژ دەكات و راست و بێگەرد دەبێت. ئەگەر قەرزاریش بێت بەخێرایی قەرزەكەی دەداتەوە. ئەگەر نەخۆش بێت چاك دەبێتەوە وە ئەگەر دوژمنی هەبێت ئەوا بەسەریدا زاڵ دەبێت.

**زەوی :** ئەگەر كەسێك لە خەویدا بینی لەسەر زەویەكەی سەوزە گیا و خانوی هەبێت ئەوا دەبێتە خاوەنی زانست و پاداشتی

رۆژی کۆتایی وەردەگرێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەبیابانێکدا بوو وە ئەو شوێنەی ناسی ئەوا سەفەرێکی دوور دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زەوی هەڵبکەنێت و لە خۆڵەکەی بخوات ئەوا بەئەندازەی ئەوە سەروەت بەدەست دێنێ. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بێ ئەوەی چاڵو چۆڵی هەبێت لەناو زەویەکەدا دیارنەمێنێ بەڵگەی ئەوەیە زو بەزوو دەمرێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زەوی بەشێوەی بیر یان ژێر زەمین هەڵبکەنێت ئەوا بە فرت و فێڵ سەروەت بەدەست دێنێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زەوی بیگرێت ئەوا لەلایەن ژنانەوە دوچاری خەم و پەژارە دەبێت و سەروەتی لەدەست دەچێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە زەویەکی پان و بەرینەوە بڕوات بۆ زەویەکی تەنگ و تەسك ئەوا لەکاری چاکەوە دەڕوات بۆ کاری خراپە.

**زەمیلە** : لەخەودا لێکدانەوەی زەمیلە ژن یان کەنیزەکە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زەمیلەیەکی هەبێت ئەوا خزمەتکارێك پەیدا دەکات.

**زەنجەفیل** : زەنجەفیل لە خەودا بەڵگەی خەم و پەژارەیە و خواردنی لە خەودا بۆ بینەری خەوەکە زەرەر و زیانی هەیە.

**زەنگی ئاسن** : بینینی زەنگی ئاسن لە خەودا خەم و پەژارە و لێدانی زۆر خراپە بەگشتی زەنگی ئاسن لە خەودا هیچ سودو قازانجێکی نیە.

زەنگ ( زەنگۆڵە ) : بینینی زەنگ لەخەودا بەڵگەی شەڕو ئاکۆکیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی کەسێکی ئاشنا زەنگی پێبدات ئەوا لەگەڵیدا بەشەڕ دێت.

زلوبیا : بینینی زلوبیا لە خەودا بەڵگەی هەوڵ و کۆششی زۆر و بەدەست هێنانی سەروەت و سامان و سەیران و خۆش حاڵیە.

زستان : لەخەودا بینینی زستان بەڵگەی پادشایە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زستانێکی ساردەو خەڵکی ئەو شوێنە دوژاری ئازار بوون ئەوا خەڵکی ئەو شوێنە لەلایەن پاشاوە دوچاری ئازار و چەرمەسەریێ دەبن. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی هەوا زۆر ساردبێت بەڵام ئازار بە هیچ کەس نەگەیەنێ ئەوا لەلایەن پادشاوە سودو قازانج دەگات بە خەڵکی ئەو جێیە.

زەهر : لەخەودا لێکدانەوەی زەهر سەروەتی حەرام و جەنگ و پیاو کوشتنە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زەهر بخوات بە ئەندازەی ئەوەی کە دەیخوات سەروەتی حەرام دەخوات یان خوێنێکی ناڕەوا دەڕژێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەشی وەرهەم بکات بە خواردنی زەهرەکە ئەوا سەروەتی حەرام بەدەست دێنێ.

زەیتونی رەش : ئەگەر کەسێك لە خەویدا زەیتون ببینێ ئەوا دوچاری خەم و پەژارە دەبێت چونکە زەیتون تام ناخۆش و تاڵ و رەنگ رەشە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زەیتون بخوات دوچاری خەم و پەژارە دەبێت.

زنجیر : زنجیر لەخەودا بەڵگەی تاوان و گوناهە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زنجیر بپچڕێنێت و توڕی بدات ئەوا لە گوناه و تاوان تەوبە دەکات و بەرەو لای خوای گەورە دەگەڕێتەوە.

زیندان : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لە زینداندا بێت وە ئەو زیندانەی هەرگیز نەبینبێت ئەوا لەناو دەچێت چونکە زیندانی نەناسراو قەبرە. ئەگەر زیندانێکی ناسراو ببینێت ئەوا دوچاری خەم و پەژارە دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زیندانیبێت و قاچی کۆت و زنجیر کرابێت ئەوا لەوکارو پیشەیەی کەهەیەتی بۆ ماوەیەکی دوروو درێژ دەمێنێتەوە.

زیندوبونەوەی مردو : ئەگەر کەسێك ببینێ مردویەك پێی بڵێ من زیندوم بەڵگەی ئەوەیە وەزعی ئەو کەسە لە هەمو بوارەکاندا چاکەو خوای گەورە لەو ڕازییە.

زیلۆ کومبار ( حەسیر ) : ئەگەر زیلۆ لەخەودا پان بێت بەڵگەی تەمەن درێژی و بەڕێوە چونی کارەکانە وە هەرچی زیلۆ درێژتر بێت لێکدانەوەکەی چاکتر دەبێت. ئەگەر زیلۆ لول کراو بێت تەمەنی کەم دەبێت و هەژار و کەم دەست دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەسەر زیلۆیەکی بچوك دانیشتبێت و ئەو زیلۆیە لەژێریدا درێژ و گەورە بێت ئەوا بژێوی زیاد دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زیلۆ بە دەستی خۆی کۆبکاتەوە و بیخاتە گۆشەیەکی ماڵەکەی بەڵگەی ئەوەیە پلەو پایەیی خۆی لەناو دەبات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زیلۆی دابێت بەسەر شانیدا و بیبات بەڵگەی ئەوەیە کە گوناه و تاوانی زیاد دەکات. ئەگەر کەسێك لە

خەویدا بینی زیلۆ لول بکات و بیدات بەکەسێك ئەوا تەمەنی گەیشتووەتە کۆتایی. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زیلۆی بچوك و ئەستوری هەبێت ئەوا هەژار دەکەوێت بەلأم تەمەنی درێژ دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زیلۆی ناسك و گەورەی هەبێت ئەوا بژێوی زیاد دەکات بەلأم تەمەنی کورت دەبێت.

زرشك : زرشك لە خەودا بەلگەی خەم و پەژارەیە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زرشك بخوات دوچاری خەم و پەژارە دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زرشك لە درەخت لێبکاتەوە و کۆی بکاتەوە ئەوا لەگەڵ پیاوێکی چەکل دا شەڕ دەکات.

زیادبون : گەر لەخەودا لەچاکەو دروستکاریدا ڕوو لە زیادبون بو ماناکەی چاکەیە وە ئەگەر زیادبونەکەی لەگوناح دابێت خراپەیە.

زراو : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زراوی خەلکی بخوات ئەوا رق و کینەی خەلکی دەخوات و پیش دەخواتەوە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زراوی چوارپێ بخولت ئەوا بە ئەندازەی ئەوەی کە دەیخوات سەروەتی حەرام بەدەست دێنێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زراوی ئاژەڵە وەحشیەکان بخوات بەلگەی ئەومیە تورەو ناساز دەبێت.

زیرە : لەخەودا لێکدانەوەی زیرە هەرچەند کەمێك تاڵە بەلأم لە تامی شیرین نزیکە بەلگەی سودو قازانجە وە ئەگەر لە زەعفەراندا بێت ئەوا بەلگەی نەخۆشیە، وە خواردنی شلەی زیرە لە خەودا دوژمنی جەنگ و خەم و پەژارەیە.

زمڕوت : ( نگين ) : لەخەودا لێکدانەوەی زمڕوت منداڵ یان برا وەیان سەروەتی حەلاڵە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زمڕوتی هەبێت وەیان کەسێك پێی بدات ئەوا منداڵ یان براکەی دەمرێت وەیان بێسەر و شوێن دەبێت و سەروەتی لەدەست دەدات.

زین : لەخەودا لێکدانەوەی زین ئەگەر بەسەر پشتی چوارپێکانەوە نەبێت بەلگەی خراپیە. ئەگەر بەسەر پشتی چوارپێیەکەوە بێت لێکدانەوەکەی بەستراوە بەو کەسەوە کە سواری بوە چونکە زین یەکێکە لە ئامێری چوار پێ. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زینێك بکرێت یان کەسێك پێی بدات ئەوا دەبێتە خاوەنی کەنیزەك یان ژن دەهێنێ و دەبێتە خاوەن پارەو سەروەت و سامان وە لەوانەیە ئیرسی پێ بگات. ئەگەر زینەکەی بشکێ وەیان ونی بکات ئەوا هاوسەرەکەی دەمرێت وەیان نەخۆش دەکەوێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زینەکەی لە زێڕ و زیو دروست کرابێت ئەوا ژنەکەی خۆپەرست و دەمار زل دەبێت و لە کاروباری دینیدا سست و تەمەڵ دەبێت. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی زینەکەی رەش و سادەبێت و نە رازاوەبێت ئەوا ژنەکەی پارسا و دیندار دەبێت. وە دروستکەری زین لەخەودا بەلگەی خزمە نزیکەکانی ژنە.

زۆران بازی (کوشتی) (مصارعه) : ئەگەر کەسێ لەخەویدا لەگەڵ کەسێکی تردا زۆران بگرێتو سەربکەوێت بەسەریدا بەلگەی ئەوەیە حاڵو گوزەرانی باش دەبێت بەڵام هەردوکیان لەسەرپێ بونو یەکتری نەدەن بەزەویدا بەلگەی ئەوەیە ئازار دەدەن لە یەکتری.

## پیتی ( ژ )

**ژیژگ** : لەخەودا لێکدانەوەی ژیژگ دوژمنی ناپاك و بەدنەخلاقە. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ژیژگی کوشت بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێت. وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی گۆشتی ژیژگی خوارد بەو ئەندازەیە سەروەتی دوژمن دەخوات وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی ژیژگ ئازارێکی پێبگەیەنێ لەلایەن دوژمنەوە ئازاری دەدرێ بەتایبەت ئەگەر لە برینەکەی خوێنی لێ بێت.

**ژن** : بینینی ژنی جوان لە خەودا بۆ پیاوان بەڵگەی شادی و کامەرانیە وە ژنی پیر دونیاو سەرقاڵیەکانی دونیایە. بینینی ژنان لەخەودا بۆ پیاوان بەگشتی شادی و گەیشتن بە مەبەستە وە ئەندازەی ئەو شادیە بەندە بە جوانی و قەڵەوی و لاوازی و توانایی و پلەی ئەو ژنەوە کە دەیبینێ. چاکترین ژنان لە خەودا ژنێکە کە ناسراو نەبێت، ژنی چاك و باڵا جوان بەڵگەی فراوانی بژێوییە بەڵام ژنی ناشیرین و لاواز بەڵگەی قات و قڕییە. ژنی خۆشحاڵ و ئارایشکراو بەڵگەی دەستکەوتنی ئارەزوەکانی دونیایە. وە پیرەژنی ناشیرین و چلکن بەڵگەی خراپی وەزع و نامرادیە.

**ژێرسك** : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی سەیری ژێرسکی بکات و وابزانێت ئەوجێگەیە هیچکات موی پێوە نیە ئەوا کارەکەی پەکی دەکەوێت و بن بەست دەکات. ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی بەژێرسکیەوە موی زۆری پێوەبێت ئەوا لەبەرانبەر ژناندا فەقیر و

هەژار دەبێت وە ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەژێرسکیدا نەخۆشی و ئازار پەیدا ببێت ئەوا بەوئەندازەیە دوچاری نەخۆشی و ئازار دەبێت.

ژمارەگان : ژمارە یەك لەخەودا چاکەیە، ژمارە دوو بۆچونی لەبارەوە نییە، بەڵام ئەگەر ژمارە سێ بو لەکاری خۆت بەهرەمەند دەبیت، ئەگەر ژمارەکە چوار بوو هیچی تری لەگەڵدا نەبێت چاکە، ئەگەر ژمارە پێنج ببینی لەکاتێکدا نوێژەکان بکەیت چاکە، ئەگەر ژمارە شەش ببینی زۆر چاکەو بەئاوات دەگەیت، وە ئەگەر حەوت یان هەشت ببینی خراپە، وە ئەگەر ژمارەی نۆ ببینی بەڵگەی زەحمەتو گەندەڵییە، ئەگەر ژمارە دە ببینیت بەئاواتو مەبەستی دینو دنیای خۆت دەگەیت، بەڵام ژمارە یانزەت ئەگەر بینی لەماوەیەکی دورو درێژدا بەسەر ئەنجام دەگەیت، وە ئەگەر ژمارە دوانزەت بینی چاکەیە، وە ئەگەر ژمارەی سیانزەت بینی کاروبارت گیروگرفتو داخراو دەبێت، ژمارەی چواردەت بینی چاکە، وە ئەگەر ژمارەی پانزەت بینی کاروبارت شێواو پەرشو بڵاو دەبێت، وە ئەگەر ژمارەی شانزەت بینی حاڵو گوزەرانت باش دەبێت، وە ئەگەر ژمارەی حەڤدەت بینی شتە وونو لەکیس چووەکان دوبارە پەیدا دەبنەوە، ئەگەر هەژدەت بینی کارت بەئەنجام ناگات، ئەگەر ژمارە نۆزدەت بینی کاری بێ ئەرکت بۆ دێتە پێش، بەڵام ئەگەر ژمارە بیست ببینی سامان بەدەست دێنیو بەسەر دوژمندا زاڵ دەبیت، ئەگەر ژمارە سی ببینی لەگەڵ کەسێکدا شەڕ دەکەیتو کارتان دەگاتە دادگاو بە ئاواتت دەگەیت، وە ئەگەر ژمارە چل ببینی کارت بەبن بەست دەگات. وە ئەگەر ژمارەی پەنجا ببینی دوچاری ڕەنجو گرفتاریی دەبیت. ئەگەر

ژمارەی شەست ببینی سوێندێکی ناڕەوات دێتە گەردن کەوا پێویست دەکات بڕێوی شەست هەزار بدەیت وە یان ڕۆژووی بەردەوام، وە ئەگەر ژمارە حەفتا ببینی کارت درێژە دەکێشیو دوادەکەوێت، ئەگەر ژمارەی هەشتا ببینی بەتاوانی زنا دەستگیرت دەکەنو هەشتا شەلاقت لێ دەدەن، وە ئەگەر ژمارەی نەوەد ببینی لەگەڵ ژنێکی گەورەی میرزادەدا هاوسەرگیری دەکەیت، وە ئەگەر ژمارەی سەد ببینی سەرکەوتو دەبیت، وە ئەگەر ژمارەی دوسەد ببینی دوژمن بەسەرتدا زاڵ دەبێ، وە ئەگەر ژمارەی سێ سەد ببینی درەنگ بەئاوات دەگەیت، ئەگەر ژمارەی چوارسەد ببینی بەسەر دوژمندا زاڵ دەبیت، وە ئەگەر ژمارەی پێنج سەد ببینی کارت وازلێ دێنیو بەناتەواوی دەیهێڵیتەوە. ئەگەر ژمارەی شەش سەد ببینی بە ئامانجت دەگەیت، ئەگەر ژمارەی حەوت سەد ببینی هیچ بۆچونێکی لەبارەوە نییە، بەڵام ئەگەر هەزارت بینی بەسەر دوژمندا زاڵ دەبیت، لەبارەی ژمارەی دوهەزارەوە خراپەیە، ئەگەر ژمارەی سێ هەزارت بینی بەهێزو توانا دەبیت، ئەگەر چوار هەزارت بینی بەڵگەی توش بونو زیانە، ئەگەر پێنج هەزار ببینی ناودارو پیرۆز دەبیت، شەش هەزارت بینی پیرۆزی دەبیت، ئەگەر حەوت هەزارت بینی فراوانی لەکاروبارداییە، ئەگەر هەشت هەزار ببینی کاڕوبارت ڕێکو پێك دەبێت، وە نۆ هەزارت بینی خراپەیە، وەژمارەی دەهەزار زیانە، ئەگەر بیست هەزارت بینی بەسەر دوژمندا زاڵ دەبیت، وە سی هەزاریش سەرکەوتنە، وە چل هەزار سەرکەوتنە وە ئەگەر پەنجا هەزارت بینی لەناو ئازاردا دەبیت، ئەگەر ژمارەی شەست هەزارت بینی بەڵگەی شادومانییە، ئەگەر حەفتا هەزارت بینی دوژمن بەسەرتدا زاڵ دەبێ، ئەگەر هەشتا هەزار

یان ئەوەندە هەزارت بینی بەسەر دوژمنندا زاڵ دەبی، ئەگەر سەد هەزارت بینی بە ئارەزووەکانت دەگەیت.

ژمارە کردن : ئەگەر کەسێك لە خەویدا بینی لەگەڵ کەسێکدا ژمارەو حساب بکات ئەوا دوچاری رەنج و ئازار دەبێت.

ژنانی : ئەگەر کەسێك لەخەویدا ژنانی بێتو خۆی وەکو ژنان ئارایشت بکات ئەوا دوچاری بەلایەك دەبێت، ئەگەر لەگەڵ ژنانییەکاندا هەڵس‌و کەوتی کرد بەڵگەی ئەوەیە لەگەڵ کەسانی بەد رەوشتدا هەڵسوکەوت دەکات.

## پیتی ( س )

ساز : لێکدانەوەی ساز لەخەودا قسەی درۆو دەلەسەو هیچو پوچە. ئەگەر ببینێ کەسێك لەبەردەمیدا ساز لێ بدات بەڵگەی ئەوەیە کە قسەی بێ سەروبەرەو درۆو پڕوپوچ دەبیسێ. ئەگەر لەگەڵ سازدا ڤیسارەو نەی ببینێ ئەوا دوچاری غەمو پەژارە دەبێت. ئەگەر ببینێ سازەکەی بشکێ یان وون بێت لە گوناحو تاوان تۆبە دەکات، هەروەها ئەگەر نەخۆش بێت لەخەویدا ساز لێ بدات دوچاری مەرگ دەبێتەوە.

سابون : ئەگەر لەخەودا ببینێ جلو بەرگی خۆی بە سابون بشوات ئەوا لە گوناح کردن دەست هەڵ دەگرێو تۆبە دەکات. ئەگەر جلو بەرگی کەسێکی تر بە سابون بشوات ئەوا ئەو کەسە لەکاری خراپ دوور دەخاتەوە، ئەگەر لەخەودا سابون بخوات ئەوا شتێکی حەرام دەخوات.

سەر : ئەگەر کەسێ لە خەویدا ببینێ سەربڕاوێك لە شوێنێکدا فڕێ درابێت ئەوا ژمارەیەك لە سەرکردەو گەورە پیاوان لەو شوێنەدا کۆدەبنەوە. ئەگەر ببینێ پێستی سەری چوار پێیەك یان گیاندارێکی درندە یان مرۆڤێك بخوات ئەوا سەروەتێك بەدەست دێنێ، ئەگەر سەرێکی نەناسراوی خوارد ئەوا سەرمایەی کەسێك دەخوات. ئەگەر سەری مریشکێکی خوارد ئەوا سەروەتی پاشایەك دەخوات. ئەگەر ببینێ سەری مردوویەك لەگەڵ سەری تردا بهێنن بۆی ئەوا

سەرکردەی ئەو گروپە دێت بۆلای و لەلایەن ژنانەوە سودو قازانجی پێ دەگات بە تایبەت ئەگەر لە خەودا گۆشتی ئەو سەرانە بخوات. ئەگەر ژنێك ئەو خەوە ببینێ ئەوا لە لایەن کەسێکی سەرمایەدارەوە قازانجی پێ دەگات. ئەگەر ببینێ سەری مەڕێك بخوات ئەوا تەمەن درێ دەبێ و سەروەت و سامان بەدەست دێنێ، ئەگەر ببینێ سەری گایەك بخوات ئەوا سەروەت و سامانی پێ دەگات هەروەها ئەگەر سەری بزنێك بخوات لە لایەن کەسێکی گەورەوە سەروەت و سامانی پێ دەگات.

سەرا : ئەگەر کەسێ ببینێ لە سەرایەکی گەورەدا کە کۆشك و تەلاری هەبێ ئەوا لە ڕۆژی کۆتاییدا پلەو پایەی دەبێت ئەگەر ببینێ ئەو سەرایە دەرگاکەی بشکێ یان بسووتێ ئەوا ئازارو ئەشکەنجە بە خاوەنی سەراکە دەگات. ئەگەر ببینێ سەراکەی گەورە ببێ ئەوا بە ئەندازەی ئەوە بژێوی زیاد دەکات وە ئەگەر پێچەوانەی ئەوە ببینێ ئەوا بژێوییەکەی کەم دەکات. ئەگەر ببینێ دەرگای سەراکەی هەڵبکەنن ئەوا دەرگای خێرو چاکەی بە ڕوودا دادەخرێت و بەندایەتی و نوێژکردنی کەم دەبێتەوە. ئەگەر ببینێ دەرگای سەرایەکی کۆنە هەڵبکەنێ ئەوا دەرگای چاکەخوازی بە ڕوویدا دەکرێتەوەو شادمان دەبێت. ئەگەر بچێتە ناو سەرایەکی تازەوە ئەگەر سەرمایەداربێت زیاتری دەبێت و ئەگەر هەژاربێت دەبێتە سەرمایەدار.

سەرما : لێکدانەوەی سەرما لەخەودا، ڕەنج و بەڵاو زیانە. ئەگەر کەسێ ببینێ سەرمای بێت بە ئەندازەی ئەو سەرمایە دوچاری تەنگ دەستی و هەژاری دەبێت. ئەگەر ببینێ سەرما ئازارو گەزەندەی

گەیاند بە لەشی ئەوا لە لایەن خزمەکانییەوە ئازاری پێ دەگات. ئەگەر ببینێ سەرما لەشی ووشك بكات ئەوا لەو نزیكانەدا دەمرێت یان كەسێ لە خزمەكانی دەمرێت.

سەتڵ : ئەگەر لە خەودا ببینێ سەتڵی هەبێت، خزمەت كارێك پەیدا دەكات وە ئەگەر ببینێ سەتڵەكەی بشكێ، خزمەتكارەكەی دەمرێت.

سەرە نێزە : ئەگەر لەخەودا ببینێ سەرە نێزە بكات بە لەشی دوژمندا، بەڵگەی ئەوەیە بە بەڵگەو حیلمەوە بەسەر دوژمنی دا زاڵ دەبێت وە ئەگەر ببینێ سەرە نێزەكەی بشكێ وە یان وون بێت لێكدانەوەكەی پێچەوانەیە.

سەفەركردن : ئەگەر كەسێ لەخەودا ببینێ سەفەر بكات وە بۆ جێگەیەك بڕوات كە چاكتربێت لە جێگەكەی خۆی ئەوا وەزعی چاك دەبێتو كارەكانی بەرەو پێش دەڕۆن وە ئەگەر خراپتر بوو لێكدانەوەكەی پێچەوانە دەبێ.

سەقایی كردن (ئاوكێشی) : بینینی ئاوكێش لەخەودا بەڵگەی پیاوێكی دیندارە. ئەگەر ببینێ ئاوكێشی بكاتو ئاو بەخەڵكی بدات ئەوا چاكەو خێر لەگەڵ خەڵكی دەكات.

سەلام كردن : ئەگەر كەسێ لەخەویدا ببینێ هاوڕێیەكی سەلامی كرد ئەوا لەگەڵ دوژمنەكەیدا ئاشتی دەكات. ئەگەر ببینێ كەسێكی نامۆ سەلامی لێ بكات ئەوا نەناسراوێك لەگەڵیدا دەبێتە هاوڕێ. ئەگەر ببینێ كەسێك سەلامی لێ بكات وە هەرگیز ئەو كەسەی نەبینیبێ ئەوا لە ئەشكەنجەی پەروەردگار بەدوور دەبێت.

ئەگەر ببینێ پیرێکی ئاشنا سەلامی لێ بکات ئەوا لەگەڵ ژنێکی جواندا هاوسەرگیری دەکات.

سەرین : سەرین لەخەودا بۆ بینەری خەوەکە خزمەتکارە، وە ئەگەر ببینێ سەرینی تازەو ڕەنگ سەوزی هەبێ یان کەسێ پێی بدات خزمەتکارێکی دروست کار پەیدا دەکات وە ئەگەر ببینێ سەرینەکەی کۆنەو پیس‌و ڕەنگ ڕەش بێ پێچەوانەی ئەوەیە، وە ئەگەر ببینێ سەرینەکەی بدڕێت یان بسووتێ یان وون بێت خزمەتکارەکانی ڕا دەکەن یان ڕەنج‌و بەلایەك بەسەریدا دێت.

سەربان : ئەگەر کەسێ ببینێ لەسەربانی ماڵێکی نا ئاشنادا ڕاوەستابێت ژنێك دەهێنێت کە بە ئەندازەی بەرزی ئەو سەربانە بەڕێزو سەنگین دەبێت وە ئەگەر ببینێ بەسەربانی ئاشنایەکەوە ڕاوەستابێت، شەرەفێکی گەورەی دەست دەکەوێت کارەکانی دروست دەبن.

سەگ : لێکدانەوەی سەگ لەخەودا دوژمنێکی هەڵە خەرجە، بەلام میهرەبانە. ئەگەر دەڵ ببینێ ژنی دەست هەڵەیە وە سەگی ڕەش دوژمنێکە لە خێڵی عەرەب وە سەگی سپی دوژمنێکە لە خێڵی فارس‌و عەجەم. ئەگەر ببینێ سەگ پاسی دەرگاکەی بکات لە دوژمنەوە قسەیەکی ڕەق دەبیسێ. ئەگەر ببینێ سەگ قەپی لێ بگرێت دوژمن ئازارێکی پێ دەگەیەنێت وە ئەگەر ببینێ لیکی سەگ چووە جل‌و بەرگەکەیەوە ئەوا دوژمنێك بیرەوەرییەکانی ئازار دەدات. ئەگەر ببینێ گۆشتی سەگ بخوات بە دوژمنێك دوژمنێکی تر لەناو دەبات. ئەگەر ببینێ نان بە سەگ بدات ڕزق‌و ڕۆزی زیاد دەکات

ئەگەر ببینێ سەگ لێی نزیك ببێتەوە ئەوا دوژمن تەماعی تێ دەكات. ئەگەر ببینێ سەگ هانای بۆ بێنێ ئەوا پشت بە دوژمنێكی خراپ ئەبەستێو لەكاردا یارمەتی دەدات، ئەگەر ببینێ شیری سەگ بخوات ئەوا بەدەست ترسو لەرزێكی گەورەوە هەراسان دەبێو لەنێوان ئەو وە دوژمندا ئەگەری بەرپابوونی شەڕی تێدایە. ئەگەر ببینێ سەگ لە دەستی ڕابكات ئەوا دوژمن لێی دەترسێ. ئەگەر ببینێ دەڵێك (سەگی مێینە) هاتە ماڵەكەیەوە ئەوا لەگەڵ ژنێكی پەستو هەڵە خەرجدا هاوسەرگیری دەكات، ئەگەر ببینێ سەگێك كەڵبەی لێ بدات ئەوا دوچاری ئازارو ئەشكەنجە دەبێتەوە.

**سەرپەرشتیار** : ئەگەر كەسێ لەخەویدا ببینێ ببێت بە سەرپەرشتیاری شوێنێك، بەڵگەی ئەوەیە دوشمن لەگەڵیدا فڕوفێڵ دەكات. ئەگەر بو بە سەرپەرشتیاری ئاوێكی سافو زوڵاڵ بەڵگەی ئەوەیە دەبێتە ئەمینداری پادشا، ئەگەر ببینێ لە پلەوپایەی كەم بكرێتەوەو دەست بەردار بكرێت بەڵگەی ئەوەیە زەرەرو زیان دەبینێت، ئەگەر سەرپەرشتیاری كاری خێر بێت بەڵگەی ئەوەیە خێرو چاكە دەبینێ، ئەگەر سەرپەرشتیاری كاری فەسادو تاوان بێت لێكدانەوەكەی پێچەوانە دەبێت.

**سەرپۆش** : لێكدانەوەی سەرپۆش لەخەودا بۆ ژنان مێردەو بۆ پیاوان ژنە، ئەگەر ژنێ لەخەویدا سەرپۆشەكەی بكەوێتە خوارەوە بەڵگەی ئەوەیە لەمێردەكەی جیا دەبێتەوە. ئەگەر ببینێ بەشێكی سەر پۆشەكەی بسوتێ بەڵگەی ئەوەیە لەلایەن فەرمانڕەواو دەسەڵاتداری ئەو شوێنە ترسێك بە مێردەكەی دەگات.

سەرکەوتن : ئەگەر ببینی لە سەر کێوێك دانیشتویت یان لەسەر درەختێك یان تەپۆلکەیەك یان کۆشکێك، ئەوەی کە خوازیاریەتی بەدەستی دێنێت وە هەندێکیش دەڵێن ئەگەر سەرکەوتنەکەی بە نارەحەتی بێت، ئەوەی کە بە دەستی دێنیٚ بە نارەحەتیو ناسۆرەوە بەدەست دێت وە ئەگەر ببینیٚ بە پلیکانەدا سەربکەوێت لە کاروباری دینیدا پلەو پایە بەدەست دێنێت بە تایبەت ئەگەر پلەکانەکە لە جۆری گڵ بێت. وەئەگەر پلەکانەکە لە جۆری بەردو گەچ بێت لەدیندا کەموکورتی دەبێت.

سەڕافی : لێکدانەوەی سەڕافی لەخەودا، لێپرسراوێکی تەماعکارە. ئەگەر کەسێکی ڕەوشت بەرزو چاکی لەخەودا بینی کە سەڕافی بکات ئەوا زانستو زانیاری فێر دەبێت. ئەگەر بازرگانی لەخەودا بینی سەڕافی بکات ئەوا لە ڕێگای بازرگانییەوە سەروەتو سامان بەدەست دێنیٚ.

سەوزە - سەوزایی : سەوزە لەخەودا بەڵگەی دینە. ئەگەر کەسیٚ ببینیٚ زەوییەکی هەبێتو سەوزەی زۆری لیٚ ڕوابێت بەڵگەی ئەوەیە صالحو داوێن پاکە. ئەگەر ببینیٚ سەوزەی نەناسراو لەزەوییەکەیدا ڕوابێت وە ئەو بەسەرسامییەوە سەیریان بکاتو بزانێت زەویو ناوەکە خۆی خاوەنییەتی، هەموو ئەوانە بەڵگەی دینو دنیایە. ئەگەر ببینیٚ درەخت گەلی ناسراو وەکو سێو لەو بابەتانە لە زەوییەکەدا هەبێت، بەڵگەی ئەوەیە بژێوی زیاد دەکات وە ئەگەر سەوزەی تاڵو نەناسراوی بینی ئەوا لێکدانەوەکەی

پێچەوانەیە. ئەگەر سەوزەی ناسراوی بینیو لێی خوارد ئەوا سەروەتو بژێوی زۆر بەدەست دێنێ.

سەوزەڵانی : لێکدانەوەی مێرگو سەوزەڵانی لەخەودا دینی پیرۆزی ئیسلامە ئەگەر ببینێ بەسەوزەڵانییەکدا کە خۆی خاوەنی نەبێت پیاسە بکات بەڵگەی ئەوەیە دینێکی پاکو بێگەردی دەبێت، ئەگەر ببینێ سەوزەڵانییەکە هینی کەسێك بێتو ئەو تەماشای بکات بەڵگەی ئەوەیە لەگەڵ کەسێ پاکو ڕەوشت بەرزدا هەڵس‌وکەوت دەکات، ئەگەر لە سەوزەڵانییەکدا کە هی خۆی بێت پیاسە بکات بەڵگەی ئەوەیە ژیانی فراوانی پەیدا دەکاتو کارەکانی بەرەو پێش دەڕوات.

سەهۆڵ : لێکدانەوەی بینینی سەهۆڵ لەخەودا بەتایبەت لەوەرزی زستاندا غەمو پەژارەیە.

سپێناخ : بینینی سپێناخ لەخەودا غەمو ئەندێشەیە وە خواردنی زیانو کەمبونەوەی سامانە بەڵام ئەگەر ببینێ لەگەڵ گۆشتو ڕۆندا سورکرابێتەوە وە لێی بخوات بە ئەندازەی ئەوەی کە خواردویەتی خێرو سودی پێ دەگات.

سڵاوات دان (درود) : ئەگەر کەسێ لەخەویدا سڵاوات لە دیاری پێغەمبەر (د.خ) بدات ئەوا ئارەزووەکانی بەدی دێنو بژێوی زیاد دەکاتو کۆتایی کارەکانی بەخۆشی تەواو دەبێت.

سمۆرە : لێکدانەوەی سمۆرە لەخەودا پیاوێکی نەناسراو و دەوڵەمەندە. ئێسقانو پێستی سمۆرە لەخەودا داراییو نیعمەتە وە گۆشتەکەی سامانی پیاوێکی نەناسراوە. ئەگەر ببینێ سمۆرە

بکوژێتو گۆشتەکەی فڕێدا ئەوا سەروەتو سامانی پیاوێکی نەناسراو لەناو دەبات.

سرکە : لێکدانەوەی سرکە لە خەودا، ماڵی حەڵاڵو بەرەکەتە وە خواردنەوەی سرکە لە خەودا لێکدانەوەی باشە.

سرود : لێکدانەوەی سرود خوێندن لەخەودا، قسەی پڕو پوچو درۆیە ئەگەر ببینێ سرود بخوێنێ قسەیەکی درۆ دەکاتو دوچاری غەمو پەژارە دەبێت. ئەگەر ببینێ سرودێك بە سازو دەهۆڵ بخوێنێ ئەوا دوچاری بەڵایەك دەبێت، ئەگەر ببینێ سرود بخوێنن و بگریت، ئەوا قسەیەکی درۆ دەبیسێ.

سرێش : لێکدانەوەی سرێش لەخەودا، غەمو پەژارەیەو خواردنی بەڵگەی کەمو کورتی سەروەتو سامانە.

سمێڵ : سمێڵ لە خەودا بەڵگەی هەیبەتو شکۆیە. ئەگەر ببینێ کەسێ بە مقەست سمێڵی ببڕێتو ئارایشی بکات لێکدانەوەکەی چاکە بەڵام ئەگەر ببینێ سمێڵی لەبندا بتاشێ ئەوا پلەو پایەی کەم دەبێتەوە.

سوراحی : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ سوراحیەکی پڕ لە ئاو یان شەربەتی هەبێتو لێی بخواتەوە ئەوا ژن دەهێنێ ومیان لە ژنەکەی یان کەنیزەکەکەی کوڕێکی دەبێت.

سورمە (کل) : لێکدانەوەی سورمە لەخەودا سەروەتە. ئەگەر ببینێ بۆ بەهێزکردنی چاوی سورمەی بەکارهێنا، ئەوا خوازیاری دروستیو چاکسازی یە لە کاروباری دینیدا. ئەگەر بۆ جوانی چاوی سورمەی بەکارهێنا ئەوا خۆی لە نێوان خەڵکیدا بە چاكو چاکەخواز

دەناسێنێ. ئەگەر ببینێ کەسێك سورمەی پێ بدات ئەوا بەو ئەندازەیە سەروەت بەدەست دێنێ.

سورمەدان (کل دان) : لێکدانەوەی سورمەدان لەخەودا ژنێکە• کە هەمیشە یادی پەروەردگار دەکاتو خەڵکی بۆ ڕێگای ڕاست بانگهێشت دەکات. ئەگەر کەسێ ببینێ سورمەدانی هەبێت ئەوا لە گەڵ ئەو جۆرە ژنەدا هاوسەرگیری دەکات بەڵام ئەگەر ببینێ سورمەدانەکەی بشکێ وە یان وون ببێت ئەوا ژنەکەی دەمرێت.

سفرە : ئەگەر کەسێ لە خەویدا ببینێ سفریەکی تازەی هەبێ ئەوا سەروەتو سامان بەدەست دێنێ، کەنیزەکی جوان دەکڕێ، وە ئەگەر سفرەیەکی پیسی هەبێت، ئەوا کەنیزەیەکی ناشیرین دەکڕێت. ئەگەر ببینێ ئەو سفرەیە پڕ لە نان بێت ئەوا سوودی لەلایەن کەنیزەکەوە بەدەست دەکات.

سواری : ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ سواری بکات ئەوا لە لایەن پاشاوە سەروەتو سامانی دەست دەکەوێت. ئەگەر ببینێ لەگەڵ ژمارەیەك خەڵکدا سواری بکاتو هەموو سوارەکان گوێ ڕایەڵی بوون. ئەوا دەبێت بە سەرۆکی گروپێك. ئەگەر ببینێ گروپێك سواری بکەن لە جێیەکدا ئەوا لەو جێگەیەدا بارانێکی توند دەبارێت. ئەگەر ببینێ سوارێکی نەناس سەروەتێك یان شتێکی پێ بدات ئەوا لەکەسێکی نەناسراوەوە سودێکی پێ دەگات. ئەگەر ئەو سوارانە ئاشنابوون ئەوا لە لایەن دۆست ویان ئاشنایەکەوە سودو قازانجی پێ دەکات. ئەگەر ببینێ سوارەکان جلوبەرگیان پۆشی بێتو سواری ئەسپی لاواز بن لێکدانەوەی پێچەوانەی ئەوی تر دەبێت.

سوپ (شۆربا) : لێکدانەوەی شۆربا لەخەودا ئەگەر ترش‌و چەور نەبێت سودو قازانجە بەڵام ئەگەر ترش بێت ئەوا دوچاری ئازارو میحنەت دەبێت.

سوورێژە : لێکدانەوەی سوورێژە لەخەودا، زیادبوونی سەروەت‌و سامانە. ئەگەر ببینێ لەشی سورێژەی دەرکردبێت ئەوا سەروەتی حەڵاڵ بە زەحمەت‌و ڕەنجەوە بەدەست دێنێ، ئەگەر سورێژەی لەشی سوورو ڕوون بوو ئەوا سەروەتی حەرام بەدەست دێنێ.

سوجدە : ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە سوجدە ببات ئەوا بەسەر پیاوێکی گەورەدا زاڵ دەبێت. ئەگەر ببینێ بۆ شتێ یان کەسێك سوجدە ببات ئەوا ئومێدو ئارەزووەکانی بەدی نایەت.

سوڵتان : ئەگەر کەسێ لە خەویدا ببینێ سوڵتانێك بڕوات بۆ مزگەوت یان ماڵێك وە یان گوندێك بەڵگەی ئەوەیە بەڵاو ئەشکەنجە بەو شوێنە دەگات. ئەگەر ببینێ لەشەڕدا بەسەر سوڵتاندا زاڵ ببێت ئەوا ئارەزووەکانی بەدی دێن.

سوزن : لێکدانەوەی سوزن لەخەودا، منداڵە. ئەگەر ببینێ سوزنی هەبێت وەیان کەسێ پێی بدات ئەوا منداڵی دەبێت. ئەگەر ببینێ سوزنی هەبێت‌و خراپ ببێ وە یان وونی بکات ئەوا منداڵەکەی بێ سەروشوێن دەبێت وە یان دەمرێت.

سۆدە : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ بۆنەخۆشێك سۆدەو ئاوی دروست کرد وە ئەو سۆدەیەش بۆ نەخۆشەکە چاك بوو ئەوا ئەو

کەسە خوازیاری دین‌و کردەوەی چاکەیە بەڵام ئەگەر سۆدەکە بۆ نەخۆشەکە چاك نەبوو لێکدانەوەی پێچەوانەیە.

**سۆفی** : ئەگەر لەخەویدا بوبێت بە سۆفی وە یان لەگەڵ سۆفیاندا لە خانەقادا نیشتەجێ بووبێت ئەوا واز لەدنیا دێنێ‌و بە کارەکانی ڕۆژی کۆتاییەوە خەریك دەبێت. ئەگەر ببینێ لە سۆفییەکان جیا دەبێتەوە ئەوا حەزو مەیل بۆ کارو ژیان پەیدا دەکات.

**سێو** : لێکدانەوەی سێو لە خەودا ئەگەر سەوز بێت مندالە، ئەگەر سوربێت سودو قازانجە لەلایەن پاشاوە وەئەگەر سپی بێت قازانجە لەلایەن بازرگانەوە وەئەگەرزەردو ترش بێت بەلگەی ئازارو نەخۆشیە، ئەگەر ببینێ سێوی سپی بکات بە دووکەرتەوە بەلگەی ئەوەیە جیادەبێتەوە لەشەریکەکەی خۆی، ئەگەرببینێ سێوی سور لەدرەختەکەی بکاتەوەو بیخوات بەلگەی ئەوەیە کچێکی دەبێت

**سۆسی ئارد** : لێکدانەوەی سۆس لەخەودا نیازمەندییە. ئەگەر ببینێ خەلکی سۆسی ئارد بخۆن ئەوا گرانی‌و قات‌و قڕی لەو سەر زەمینەدا. ڕوو ئەدات ئەگەر ببینێ سۆس لە مالەکەیدا فڕێ بداتە دەرەوە، یان بیدات بەکەسێ ئەوا لەو شوێنەدا گرانی ڕونادات.

**سێ کوچکەی قابلەمە** : بینینی سێ کوچکە لەخەودا پیاوی خاوەن مالە یان کەیبانووی مالە، ئەگەر ببینێ قابلەمەیەکی دەست کەوێت یان کەسێ پێی بدات کەیبانویەك دێنێت وە ئەگەر ببینێ قابلەمەکە بشکێ کەیبانووی مالّ دەمرێت.

ستەم کردن : ئەگەر ببینێ لەخەویدا ستەمی لێ بکرێت، ئەوا بەسەر ستەم کارێکدا زاڵ دەبێت وە ئەگەر ببینێ خۆی ستەم لە کەسێ بکات ئەوا ئەو کەسە بەسەریدا زاڵ دەبێت، ئەگەر ببینێ پاشایەك ستەمی لێ بکات ئەوا لە لایەن پاشاوە زەرەرو زیانی پێ دەگات.

سستی (لەنگی - شەل) : ئەگەر لەخەودا ببینێ یەکێ لە ئەندامی لەشی سست بێت بە شێوەیەك کەنەتوانێ لەجێگە بەرزدەبێتەوە ئەوا تۆبە دەکاتو ڕازەکانی خۆی لەخەڵکی دەشارێتەوە، ئەگەر ئەم جۆرە خەوە کەسێکی گوناحبار ببینێ لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

سنوق : سنوق لەخەودا بەڵگەی پلەو پایەو سەربەرزییەو هەندێکیش دەڵێن بەڵگەی ژنە. ئەگەر ببینێ سنوقی تازەی هەبێت ئەوا بەو ئەندازەیە پلەو پایەی دەست دەکەوێت یان ژن دەهێنێ.

سك : بە بۆچوونی ئیبن سیرین بینینی سك لەخەودا منداڵە.

سینە (سنگ) : لێکدانەوەی سینە لەخەودا شەریعەتو دینداریيە. ئەگەر لە خەودا ببینێ سینەی پان ببێت ئەوا کارەکانی بەرەو پێش دەچێت. ئەگەر ببینێ سینەی بچوكو تەنگ بێتەوە ئەوا کەلێنێك لە دینەکەیدا پەیدا دەبێت. ئەگەر ببینێ لە سەر سینەی دا خەتی نوسراوی سەوز هەبێت ئەوا خواوەندی گەورە پاداشتو خێرو چاکەی پێ دەبەخشێ بەلام ئەگەر ببینێ بە خەتی ڕەش نوسرابێ ئەوا بێ شایەتمان لە دنیا دەردەچێت.

سیر : لێکدانەوەی سیر لە خەوداماڵی حەرامە.

سێبەر : لێکدانەوە ی سێبەر لەخەودا گەورەییە هەروەها گەورەییو گرنگی پاشایش دەگرێتەوە وە لێکدانەوەی سێبەری بچوك پادشا دەگرێتەوە. ئەگەر لە خەودا سێبەری دیوار ببینێ بەڵگەی ئەوەیە لەلایەن پیاوێکی گەورەوە کە بژێوی ژیانی بە دەستی ئەوە پلەو پایەو سەر بڵندی بەدەست دێنێ. ئەگەر سێبەری درەخت لەخەودا ببینێ ئەوا ئارامیو ئاسایش دەبینێ لەو پیاوانەی کە خزمەتی دەکەن. ئەگەر ببینێ لە سێبەری درەختێکی بێ بەر یان درکێکدا بێت ئەوا کەسێکی بێ دینو بێ بڕوایەو مردنی نزیك بۆتەوە.

## پیتی (ش)

شادی : لێکدانەوەی شادی کردن لە خەودا، غەم‌و پەژارەیە. ئەگەر ببینێ کەسێك شادو خۆش ڕوو بوو سەر ئەنجامەکەی خۆشی‌و شادی دەبێ.

شار : ئەگەر کەسێ لەخەویدا بچێت بۆ شار ئەوا دینەکەی بەهێز دەبێت‌و سەرئەنجامی چاك‌و خێر دەبێت. ئەگەر ببینێ بۆ شارێك بڕوات‌و لەو شارەدا بە ئاسایشی نیشتەجێ بوو ئەوا بۆ خزمەتی پادشا دەڕوات‌و سودو قازانجی لێ دەبینێ.

شارەکان : ئەگەر لەخەویدا ببینێ بچێتە شارێکەوە بەلگەی ئەوەیە دینەکەی بەهێز دەبێ‌و بە ئارەزووەکانی دەگات. ئەگەر ببینێ لە شار چووە دەرەوە یان کردیانە دەرەوە ئەوا لێکدانەوەی پێچەوانە دەبێ. ئەگەر ببینێ لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر بڕوات ئەوا ژنەکەی تەلاق دەدات‌و ژنەکەی مێردی تر دەکات. ئەگەر ببینێ لە شاری موسڵمانانەوە بۆ شاری کافران بڕوات ئەوا دەچێتە سەر دینی کافرەکان. ئەگەر ببینێ لە شارێکی گەرمەسێردا بەفرو سەهۆڵ هەبێت ئەوا لەو شارەدا قات‌و قڕی‌و گرانی دەبێت وە ئەگەر شارێکی کوێستان بێت بەلگەی فراوانی نیعمەت دەبێت. ئەگەر ببینێ لە لادێوە بۆ شار بڕوات ئەوا بە ئارەزوەکانی ناگات.

شایەتمان (شهادتین) : ئەگەر لەخەودا ببینێ کەسکی صاڵح‌و دروست کار شایەتمان بڵێت ئەوا بە موسڵمانی یەوە لەدنیا دەردەچێت

وە ئەگەر فاسدو گوناحکار بیلێت ئەوا تۆبە لە گوناحەکانی دەکات وە ئەگەر کافرو موشرك بێت ئەوا موسڵمان دەبێت.

**شانە** : لێکدانەوەی شانە لەخەودا، پیاوێکی بێ ئەسڵو نەسەبو ریاکارە. ئەگەر ببینێ سەرو ریشی خۆی شانە بکات لەغەمو پەژارە رزگاری دەبێ.

**شانە بەسەر (پەپوسلێمانە)** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا پەپوسلێمانەی هەبوو ئەوا لەگەڵ پیاوێکی سەرناسو خێرخوازدا دەبێتە هاورێو کار پەیدا دەکات. ئەگەر ببینێ پەپو سلێمانە قسەی لەگەڵدا بکات لەکارو بارەکانی جیهان ئاگادار دەبێ.

**شان (کتف)** : شان لەخەودا بەڵگەی ئارامیو رازاوەییو جوانی یە. ئەگەر ببینێ شانی سستو لاوازو شکاوبێت ئەوا لێکدانەوەکەی پێچەوانەی ئەوەیە.

**شانو مل** : دانیاڵ (ع) دەڵێ : لێکدانەوەی شانو مل لەخەودا ئارامیو ویقارو جوانییە، ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ شانو ملی ساغو بەهێزبێت بەڵگەی ئەوەیە ویقارو ئاراستەکانی ئەو کەسە زیاتر دەبێت، ئەگەر پێچەوانەی ئەوە ببینێ بەڵگەی ئەوەیە ئەمانەتو حەقی خەڵکی بە ئەستۆی ئەو کەسە دەبێت وە هەندێکیش دەڵێن ئەگەر کەسێ ببینێ لەسەر شانو ملی مو بروێت بەڵگەی ئەوەیە لە جێگەیەکەوە کە پێشتر زانیاری لەبارەیەوە نەبوە سەروەتو سامان بەدەست دێنێ.

**شاهین (لە عەنقا دەچێت - شکارییە - دەنوکی رەقو چنگی بەهێزە - پەرەکانی زەردە)** : هەرکەس لەخەویدا شاهێن

ببینێ بەڵگەی ئەوەیە لە لایەن پاشایەکی ستەمکارەوە بە پلەو پایە دەگات. ئەگەر ببینێ شاهین دەستەمۆی بێ ئەوا منداڵێکی دەبێ.

شاخ (شاخی ئاژەڵ) : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ ئەندازەیەك شاخی ئاژەڵی هەبێت بەڵگەی سودو قازانجی گەورەیە. ئەگەر ببینێ شاخی مانگای هەبێت ئەوا سەروەتێك بەدەست دێنێ. ئەگەر ببینێ شاخی گای بیابانی هەبێت ئەوا لە پیاوێکی بیابانییەوە قازانجی دەست دەکەوێت. لە خەودا هەتا شاخی گەورەتر ببینێ سودەکەی زۆرتر دەبێت.

شەکر : ئەگەر کەسێ لەخەویدا شەکر بخوات ئەوا بە پەلە سەرگەرمی کارێك دەبێت لە کۆتاییدا لێی پەشیمان دەبێت، ئەگەر ببینێ خەرمانێك شەکری هەبێت ئەوا بەو ئەندازەیە سەروەتو سامان بەدەست دێنێ، ئەگەر ببینێ شەکرەکە بفرۆشێت ئەوا زەرەرو زیان دەبینێت وە کڕینی شەکر لەخەودا چاکترە لە فرۆشتنی.

شەو : ئەگەر لەخەودا ببینێ شەو ڕەش‌و تاریك بێت دوچاری غەم‌و پەژارە دەبێت وە ئەگەر ببینێ مانگەشەو بێت ئەوا بە کامەرانی‌و خۆش بەختی دەگات.

شەراب : شەراب لەخەودا ماڵی حەرامە. ئەگەر ببینێ لەناو شەرابدا نوقم بێت ئەوا دوچاری بەڵاو فیتنە دەبێت. ببینێ شەراب بخوات بە ئەندازەی ئەو شەرابە کە دەیخوات سەروەتی حەرامی دەست دەکەوێت. ئەگەر شەرابی کوڵاوی خوارد ئەوا سەروەتی حەرام بە ناڕەحەتی بە دەست دێنێ، ئەگەر ببینێ شەرابی زۆری لەماڵدا

هەبێ بە ئەندازەی ئەو شەرابە لە کوێخایەکەوە سودو قازانجی دەست دەکەوێت.

**شەربەت :** لێکدانەوەی شەربەت لەخەودا ئەگەر شیرینو خۆش بۆن بێت وەکو شەربەتی هەنار یان سێو شەش لایەنی هەیە: ١) پاکی لە دیندا. ٢) سودو قازانج. ٣) زانستی بەنرخ. ٤) تەمەنی دوورو درێژ. ٥) ژیانی خۆشو ئاسان. ٦)پەرستنی پەروەردگار. لێکدانەوەی ئەو شەربەتانەی کە ترش بێت وەکو شەربەتی ڕێواسو لیمۆو نارنج بەڵگەی غەمو پەژارەن. ئەو شەربەتانەی کە بۆنی ناخۆشو تامی تاڵیان هەیە بەڵگەی سودی دنیاییو ڕۆژی کۆتاییە. ئەو شەربەتانەی بە بیانووی چارەسەر دەخورێت بەڵگەی خێرو چاکەی دینو دنیایە.

**شەڕواڵ :** لێکدانەوەی شەڕواڵ لەخەودا، ژنە. ئەگەر ببینێ شەڕواڵ لەپێ بکات ژن دەهێنێ یان کەنیزەك دەکڕێ. ئەگەر ببینێ شەڕواڵەکەی وون ببێ ئەوا لە ژنەکەی جیا دەبێتەوە، ئەگەر ببینێ شەڕواڵەکەی دڕابێت ئەوا کەمو کورتیو ئەنگییەك لە ژنەکەیدا پەیدا دەبێت. ئەگەر ببینێ شەڕواڵەکەی بسووتێ ئەوا ژنەکەی نەخۆش دەکەوێت.

**شەرم :** شەرم کردن لەخەودا بەڵگەی ئیمانە.

**شەلاق :** ئەگەر لەخەودا ببینێ شەلاق لەکەسێك دەداتە بە کارێکەوە سەرقاڵ دەبێتو لەو کەسەیشەوە سودو قازانجی پێ ناگات، وە ئەگەر ببینێ شەلاق لە دەستی بکەوێتە خوارەوە ئەو کارەی کە بەدەستیەوەیە وازی لێ دێنێ، ئەگەر ببینێ شەلاق کاری دەکەنو خوێن لە لەشی بێتە خوارەوە قسەی سوكو ناخۆش دەبیسێ بەڵام

ئەگەر ببینێ خوێن لە لەشی ئەیەت بە ئەندازەی ژمارەی شەلاقەکان درهەم بەدەست دێنێ.

**شەلەم** : بینینی شەلەم لەخەودا بەڵگەی غەم‌و پەژارەیە. ئەگەر ببینێ شەلەم بەکەسێك بدات ئەوا ئەرك‌و غەم‌و پەژارەی پێ دەدات.

**شەمشەمە کوێرە** : لێکدانەوەی شەمشەمە کوێرە لەخەودا کەسانی گومڕایە. ئەگەر ببینێ شەمشەمە کوێرەی هەبوو لەگەڵ کەسانی گومڕادا دەبێتە هاورێ. ئەگەر ببینێ شەمشەمە کوێرە لە دەستی بەربو ئەو کەسانەی لێ دوور دەکەوێتەوە.

**شەترەنج** : یاریکردن بە شەترەنج، درۆو توهمەتە. ئەگەر ببینێ یاری شەترەنج بکات‌و لە بەرامبەرەکەی بردەوە بەڵگەی ئەوەیە لە حەرامدا بەسەر کەسێکدا زاڵ دەبێت، ئەگەر ببینێ بەرامبەرەکەی بیباتەوە ئەوا توهمەتی دەدرێتە د'ـ بینەری خەوەکەو کارەکانی بێ هودە دەبێت.

**شەلاق لێدان** : لێکدانەوەی شەلاق لێدان د ـتەبەرکردنی کاری ژنانە، ئەگەر ببینێ شەلاق کاری دەکەن لێکدانەوەکەی پێچەوانەیە.

**شەلبون** : لێکدانەوەی شەلبون لەخەودا زەلیل‌و ڕسوابونە لەناو خزماندا.

**شەڕکردن** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ لەگەڵ مرۆڤێکدا یان ئاژەڵێکدا بەشەڕ بێت یان ئاژەڵێکی تر کە لە ڕەگەزی خۆی بێت‌و سەربکەوێت لەو شەڕکردنەدا ئەوا بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێت.

**شێوەکاری** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا شێوەی ئاژەڵێك بکێشێت بەڵگەی ئەوەیە درۆ لەگەڵ پەروەردگاردا دەکات.

**شمشێر :** ئەگەر ببینێ شمشێر لەناو کێلانەکەیدا بێت بەلگەی ژنە وە بەبێ کێلان (بەرگەکەی) سەروەتو دەسەلاتە. ئەگەر ژنێك لەخەودا ببینێ شمشێر بەدەستییەوە بێت ئەوا کورێکی دەبێت، ئەگەر ببینێ شمشێرەکەی لە کێلان دابێت ئەوا مندالەکەی لە سکیدا دەمرێت. ئەگەر پیاوێك ببینێ شمشێرەکەی بەروتی بەدەستەوەبێتو بیدات لە کەسێکی ترو کاری لێ نەکرد ئەوا نەسلەکەی (رەگەزەکەی) بەرەو نەمان دەچێت، ئەگەر ببینێ شمشێر بەگەردنیدا هەلواسرابێت ئەوا لەسەر زەمینێکدا دەبێتە فەرمان رەوا. ئەگەر ببینێ بەبێ هۆ شمشێری لەکەسێکدا ئەوا ئەو کەسە نلوبلنگ دەردەکات. ئەگەر ببینێ شمشێرەکەی لێ بسێننو لەدەستی دەربهێنن ئەوا لە کارەکەی خۆی دوور دەخرێتەوە، ئەگەر ببینێ شمشێر لە کەمەری ببەستێ ئەوا تەمەن درێژ دەبێت، ئەگەر ببینێ شمشێری ئالتونی هەبێ ئەوا گەورەیەك یان سەرۆکێك ئاسایشی بۆ دابین دەکات. ئەگەر شمشێرەکەی ئاسن بێت ئەوا کارەکانی چاك دەبن وە ئەگەر لە توخمی بلور بێت ئەوا لەلایەن سەرۆك یان گەورەیەکەوە سودو قازانجی پێ دەکات وە ئەگەر شمشێرەکەی لەجۆری مرواری بێت ئەوا لەزانایانەوە کەلك وەردەگرێت.

**شوشە :** بینینی شووشە لەخەودا بەلگەی ژنەو هەندێکیش خزمەتکاری مالە، بەلام دەولەمەندو جێگیر نییە. ئەگەر کەسێ لە خەویدا شوشەیان پێدا ئەوا لەگەل ژنێکی نەدارو هەژاردا هاوسەرگیری دەکات. ئەگەر ببینێ لەناو شوشەکەدا رۆنی گول یان وەنەوشەی تێدا بێت ئەوا لەگەل ژنێکی دەولەمەندو دینداردا هاوسەرگیری دەکات، ئەگەر ببینێ لەو شوشەدا شەربەتی هەنار یان

شەربەتی بەهێ بخوات ئەوا سەروەتی ژن دەخوات. ئەگەر ببینێ شوشە بشکێنێ ئەوا ژنەکەی دەمرێت.

**شوشەی شەراب** : لێکدانەوەی شوشە شەراب لەخەودا پەرش‌و بڵاوکردنەوەو ڕێك بەندی نەکردنی ئەو سەروەت‌و شتانەیە کە لە لایدا بە ئەمانەت دایان ناوە وە ئەگەر لە شوشە شەرایدا شتێکی سەرخۆش کەری بینی بەڵگەی ئەوەیە دەبێتە حەرام خۆر.

**شۆردن** : شۆردنی سەرو لەش لەخەودا بە ئاوی دەریا یان ئاوی جۆگە بەڵگەی دۆزینەوەی ڕێگە چارەی غەم‌و پەژارەیە، ئەم خەوە ئەگەر زیندانی یەك بیبینێ ئەوا ئازاد دەبێت وە ئەگەر قەرزار بیبینێ قەرزەکانی دەداتەوە وە ئەگەر نەخۆش بیبینێ چاك دەبێتەوە.

**شفرە** : لێکدانەوەی شفرە لەخەودا سەروەتێکە لەلایەن پاشاوە بەدەست دێت، ئەگەر کەسێ لەخەویدا شفرەی هەبێت ئەوا لە لایەن پاشاوە سودی پێ دەگات، ئەگەر شفرە وون بکات ئەوا سەروەتی لەناو دەچێت.

**شکار** : ئەگەر کەسێك لەخەودا ببینێ گایەکی کێوی یان کەرە وەحشییەك یان بزنە کێوییەك شکار بکات‌و لە گۆشتەکەی بخوات، ئەوا سودو قازانجی دەست دەکەوێت.

**شکاندن** : ئەگەر لەخەودا ببینێ ئەندامێکی لەشی بشکێ ئەوا یەکێ لە نزیکەکان‌و خزمەکانی زیان دەبینێ. ئەگەر ببینێ یەکێ لە ئامێرە مۆسیقییەکان وەکو قیسارە لە خەویدا بشکێ ئەوا سودو قازانجی پێ دەگات.

**شیعر ووتن** : ئەگەر لەخەودا ببینێ شیعری مەدح یان هەجووی بە کەسێك ووت، ئەوا قسەی پڕوپوچ دەکات. ئەگەر ببینێ شاعیرێك غەزەلو مەدح بلێ ئەوا شیوەنو زاری دەکات. ئەگەر دەربارەی تەوحید شیعری ووت بەلگەی درۆیە.

**شیری ووشك** : لێکدانەوەی شیری ووشك لەخەودا بژێوی حەلاڵە. ئەگەر ببینێ لە بیاباندا شیری ووشك کۆبکاتەوە ئەوا لەسەفەردا سەروەتێك بەدەست دێنێ. ئەگەر ببینێ ئەندازەیەکی زۆر شیری ووشکی لەماڵدا هەبێت ئەوا لە سەروەتی خۆی ئەوپەڕی قازانج دەبینێ. ئەگەر ببینێ شیری ووشك بخوات ئەوا سەروەتی خۆی لە پێناو ژنەکەیدا خەرج دەکات.

**شیر (شیری تەڕ)** : لێکدانەوەی شیر لەخەودا هەرچەند تازەترو شیرین تربێت سودو قازانجی زۆرتر دەبێت. ئەگەر شیر لە کەوچکدا ببینێ ئەوا سەروەتی زیاد دەکات. ئەگەر شیری ترشاو ببینێ لێکدانەوەی پێچەوانەیە. ئەگەر ببینێ شیری تازە بخوات ئەوا سەروەتی حەلاڵ بەدەست دێنێو وە ئەگەر ژنێك لەخەودا ببینێ شیر لە مەمکیدا کۆببێتەوە ئەوا منداڵی دەبێت. ئەگەر ببینێ شیر بدۆشێ بەڵام لەجێی شیر خوێنی لەمەمکی بێت ئەوا سەروەتی حەرام بەدەست دێنێ. ئەگەر ببینێ لە مەمکی خۆی شیر بخوات ئەوا لە کاروکاسبیدا زەرەرو زیان دەبینێ. ئەگەر ببینێ بۆتەوە بە منداڵو مەمك بمژێت ئەوا بە ئارەزووەکانی ناگات.

**شیلەی تریێ** : لێکدانەوەی شیلەی تریێ لەخەودا سودو قازانجە. ئەگەر ببینێ شیلە لە تریێ (مێو) بگرێت ئەوا هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکی داوێن پاکدا دەکات.

**شیلەی درەخت (صمغ)** : ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ شیلەی هەبێت یان بیخوات ئەوا لە پارەی کەسێك خەرج دەکات. ئەگەر ببینێ شیلەیەکی زۆری هەبێتو بیدات بە کەسێکی تر ئەوا سەروەتی خۆی بە کەسێك دەدات.

**شیلان** : لێکدانەوەی شیلان لەخەودا ماڵو دارایی یە، ئەگەر ببینێ شیلان بدات بە کەسێك بەڵگەی ئەوەیە خزمەتێك بەو کەسە دەکات، ئەگەر ببینێ شیلانی هەبێتو لێی بخوات بەڵگەی ئەوەیە بەو ئەندازەیە سەروەتو سامانی دەست دەکەوێت.

**شیرینی** : لێکدانەوەی شیرینی لەخەودا شادیو بژێوی حەڵاڵە. ئەگەر ببینێ کەسێك شیرینی پێ بدات ئەوا دەبێتە هۆی کامەرانیو خۆشحاڵی ئەو.

**شوانی** : شوانی کردن لەخەودا بۆ ئاژەڵە جۆراوجۆرەکان لێکدانەوەی جیاوازیان هەیە. ئەگەر ببینێ شوانی کۆمەڵێ ئەسپ بکات بە فەرمان ڕەواییو حکومەت دەگات، ئەگەر ببینێ شوانی کۆمەڵێ کەر بکات بەخت یاوەری دەبێو هەرچەندیش ئەگەر شوانی ڕانەمەڕێك بکات سەروەتو سامانی حەڵاڵ بەدەست دێنێ.

**شێتی (دێوانەیی)** : لێکدانەوەی شێتی لەخەودا ئەوەیە کە بە ئەندازەی ئەو شێتییە سەروەتی حەرام بە بینەری خەوەکە دەگاتو

ئەو سەروەتە لە ڕێگای خێرو چاکە خوازیدا خەرجی دەکات بەڵام دەکەوێتە بەر لۆمەو سەرزەنشتی خەڵکی.

شێر : ئەگەر لەخەودا ببینێ شەڕ لەگەڵ شێردا بکات، لەگەڵ دوژمنێکدا شەڕ دەکات ئەو کەسەیان سەردەکەوێن کە لە خەوەکەدا سەر دەکەوێت. ئەگەر ببینێ شێر لە پشتەوە بێت بۆی بەڵام پێی نەگات، لە لایەن پاشاوە ترس و لەرزی بۆ دێت. ئەگەر لەخەودا ببینێ لەدەست شێر ڕابکاتو شێرەکە بەدوایدا نەڕۆیشت، لەوەی کە لێی دەترسێ پارێزراو دەبێت ئەگەر ببینێ کە گۆشتی شێر بخوات پادشا پلەی پێ دەبەخشێ.

## پیتی ( ع )

**عاشق بوون :** ئەگەر كەسێ لەخەویدا عاشقی كەسێك بێت ئەوا نیازمەندو بەتەماع دەبێت، ئەگەر ببینێ عەشقی شتێكی حەرام بوو بەڵگەی ئەوەیە كە دینی خراپو لەكەداربووە، ئەگەر ببینێ لە مەعشوقەكەی چێژی زۆر ببات ئەوا سودو قازانجێكی پێ دەگات.

**عەنبەر :** ئەگەر كەسێ لەخەویدا عەنبەری هەبێت بەڵگەی ئەوەیە بە ئەندازەی ئەو عەنبەرە قازانجو سوودی دەست دەكەوێت، ئەگەر عەنبەر بە كەسێ بدات بەڵگەی ئەوەیە خزمەتێكی ئەو كەسە دەكات، ئەگەر عەنبەرەكەی وون ببێت یان لەناو بچێت ئەوا زەرەرو زیان دەبینێت.

**عەنتەر :** لێكدانەوەی عەنتەر لەخەودا دوژمنێكی بێ دینو فێڵبازە. ئەگەر بەسەر عەنتەرەوە بوو وە ئەو عەنتەرە دەستەمۆی بوو ئەوا بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێ وە ئەگەر ببینێ لەگەڵ عەنتەردا بەجەنگ هاتو عەنتەرەكە زاڵ بوو بەسەریدا ئەوا نەخۆش دەكەوێتو نەخۆشیەكەی دەرمان نەكرێ وە یان عەیبەیەك لە لەشیدا پەیدا دەبێت كە ناتوانێ چارەسەری بكات.

**عقاب (داڵە ڕەشە) :** ئەگەر ببینێ داڵە ڕەشێك لە كۆڵانێكدا بنیشێتەوە ئەوا پادشایەك بۆ ئەو كۆڵانە دەڕوات. ئەگەر ببینێ خەڵكی ئەو كۆڵانە داڵەكە بكوژن پادشای ئەو شوێنە دەمرێت وەیان لەسەر حوكم لادەبرێت. ئەگەر ببینێ داڵەكە بیگرێت پەنا بۆ

پاشایەك دەبات وە ئەگەر ببینێ داڵەکە شتێك لەدەمی بێنێتە دەرەوەو پێی بدات بە ئەندازەی ئەو شتە بەخشیش لەپاشا وەردەگرێت.

عود : لێکدانەوەی عود لەخەودا پیاوێکی جوانو بەشەوقو زەوقە، ئەگەر ببینێ عود لە بەردەمیدا دوکەڵ بکاتو بۆنی بکات ئەوا سودو قازانجو ئاسایش لە خەڵکی دەبینێت.

عەورەت : ئەگەر کەسێ لەخەویدا عەورەتی دەربکەوێت بە شێوەیەك کە خەڵکی ببینێ ئەوا نهێنییەکانی ئاشکرا دەبێت وە ئەگەر ببینێ عەورەتی داپۆشێ ئەوا نهێنییەکانی بە پەنهانی دەمێنێتەوە. ئەگەر عەورەتی ڕووتو دیاربێتو خێرا دای پۆشێت بە شێوەیەك کەس نەیبینێ ئەگەر نەخۆش بێت ئەوا چاك دەبێتەوە وە ئەگەر قەرزار بێت قەرزەکانی دەداتەوە.

عەسا (داردەست)(گۆچان) : لێکدانەوەی داردەست لەخەودا پیاوێکی گەورەیە ئەگەر ببینێ عەسای بەدەستەوەبێت بەڵگەی ئەوەیە بەسەر بەرزیو پلەوپایە دەگات ئەگەر ببینێ عەساکەی وون ببێ لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

عەساری (ڕۆن گیری) : لێکدانەوەی ڕۆن گیری لەخەودا سەرگەرم بوونە بە کارێکی خێرو چاکەوە کە دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی باسی بە چاکە بکەنو لە دنیادا بە چاکەخوازی بەناوبانگ بێت.

عەتر : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ عەتری پێ بێت ئەگەر کەسێکی زانابێت بەڵگەی ئەوەیە خەڵکی لە زانستەکەی بەهرە دەبەن

وه ئەگەر ئەم خەونە كەسێكی سەرمایەدار ببینێ بەڵگەی ئەوەیە سودو قازانج بە خەڵكی دەگەیەنێت.

**عەنقا** : لێكدانەوەی عەنقا لەخەودا پیاوی گەورەو خۆش ڕەفتارو ڕاستگۆیە. عەنقای مێیە ژنی جوانە، ئەگەر ببینێ عەنقا هەڵی بگرێ‌و بۆ ئاسمانی ببات ئەوا لەگەڵ كەسێكی گەورەدا بۆ سەفەر دەڕوات.

**عەتر فرۆش** : ئەگەر كەسێك لەخەویدا عەتر فرۆشی بكات بەڵگەی ئەوەیە خەڵكی باسی بە خراپە دەكەن، ئەگەر ببینێ لەگەڵ عەتر فرۆشێكدا ببێتە هاوڕێ یان دۆست بەڵگەی ئەوەیە خەڵكی بە سەخاوەت‌و بەخشندەیی ناوی دەبەن.

**عەقڵ** : ئەگەر كەسێ لە خەویدا عەقڵی خۆی لە شێوەی پیاوێكدا ببینێ‌و پێی بڵێ من عەقڵی تۆم وە بینەری خەوەكە بزانێت كە عەقڵی خۆیەتی لە كاتێكدا ئەگەر كەسێكی شایستەو چاك بێت لەگەڵ كوڕی پاشادا چاوپێكەوتن دەكات‌و سوودو بەهرەی لێ دەبات.

# پیتی ( غ )

**غوسڵ کردن :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ لە ئاوی ڕوبار یان دەریادا غوسڵ دەربکات بەڵگەی ئەوەیە چاکە خوازو دیندارەو غەمو پەژارەکانی لەناو دەچێ وە ئەگەر نەخۆش بێت چاك دەبێتەوە ئەگەر قەرزاربێت قەرزەکانی دەداتەوە وە ئەگەر زیندانی بێت ئازاد دەکرێت، ئەگەر ببینێ بە ئاوی گەرم غوسڵ دەربکاتو پاشان ڕوخسارو هەردو دەستی بشوات ئەوە کاری خێر ئەنجام دەدات.

**غەواصی :** ئەگەر کەسێ لە خەویدا ببینێ لە دەریادا غەواصی بکاتو مرواری دەربهێنێ ئەوا بەو ئەندازەییە زانستو دانایی بەدەست دێنێو وەیان لەلایەن پادشاوە شتێکی پێ دەدرێت، ئەگەر لە دەریادا غەواصی بکات بەڵام هیچ دەرنەهێنێت بەڵگەی ئەوەیە سەرگەرمی زانستو زانین دەبێت بەڵام سەرکوتوو نابێتو بەهرەی لێ نابات.

## پیتی ( ف )

**فالووده :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ قەپێك فالووده بخوات ئەوا قسەیەکی چاكو جوانو لەبار دەکات وە ئەگەر ببینێ فالووده بکات بەدەم کەسێکەوە بەڵگەی ئەوەیە کارێکی چاك بۆ ئەو کەسە ئەنجام دەدات.

**فەرج (عەورەتی ژن) :** ئەگەر پیاوێك لەخەویدا ببینێ وەکو ژنان عەورەتی ژنانەی هەبێت بەڵگەی ئەوەیە زەلیلو ڕسوا دەبێت، ئەگەر ببینێ کەسێك لە گەڵیدا جوت ببێت ئەوا ئارەزووەکانی بەهۆی ئەو کەسەوە دەستەبەر دەبێت. ئەگەر ببینێ بە دو ژن یەك عەورەتیان هەبێت ئەوا هەردو ژنەکە دەبنە ژنی پیاوێك.

**فەڕاشی :** لێکدانەوەی فەڕاشی لەخەودا ژنێکی دەڵاڵە کە ژنّ بۆ پیاوان پەیدا دەکات ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ فەڕاشی بکات ئەوا بۆ خۆی یان بۆ خەڵکی ژن دەهێنێ.

**فیروزە (جۆرە بەردێکی ڕەنگ شینی گران بەهایە) :** لێکدانەوەی فیرۆزە لەخەودا سەرکەوتنو هێزو توانای پەیکەڕیی و دەرونییە، ئەگەر فیروزەیەك وون بکات ئەوا بە ئارەزووەکانی ناگات.

**فیرعەون :** ئەگەر کەسێك لەخەویدا ببینێ یەکێ لە فیرعەونەکان یان پاشایەکی ستەمکار لە شارێکدا دەسەڵاتی گرتە دەست بەڵگەی ئەوەیە ڕێبازی فیرعەونی لەو شارەدا پیادە دەکرێت.

فشە کلاونە : لێکدانەوەی فشەکلاونە لەخەودا منداڵی نۆکەرە وەکو (قەتیو پۆڕ) ئەگەر لەخەودا ببینێ فشەکلاونەی نێر بگرێ نۆکەرەکەی کوڕی دەبێت، وە ئەگەر فشەکلاونەی مێی گرت نۆکەرەکەی کچی دەبێت.

فراوانی : ئەگەر کەسێك لەخەویدا لە شوێنێکی تەنگەوە بۆ شوێنێکی فراوانو پانوبەرین بڕوات بەڵگەی ئەوەیە لە کارەکانیدا بەرەو پێش دەڕواتو لەغەمو پەژارە ڕزگاری دەبێت، ئەگەر ببینێ ماڵەکەی یان دوکانەکەی فراوان ببێت ئەوا بژێویو دارایی زیاد دەکات، ئەگەر کەسێك ببینێ جێگەکەی تەنگ ببێت لێکدانەوەی پێچەوانە دەبێت.

فرۆشتن : ئەگەر کەسێك لەخەویدا قورئان فرۆشی بکات بەڵگەی ئەوەیە دینی پیرۆزی ئیسلام لای ئەو کەسە بێ بایەخە، بە گشتی فرۆشتنی هەر شتێك کە لە لایەن دەبنەوە بەنرخ بێت خراپە. ئەگەر ببینێ لۆکەرەکەی خۆی بفرۆشێ ئەوا بەدناوو ڕسوا دەبێت.

فڕوفێڵ : فڕوفێڵ لەخەودا فێڵکردنە لەخەڵکی، ئەگەر فێڵبازێك لەخەودا ببینێ کە لەو فێڵەی خۆی یان کەسێکی تری شیفا داوە لە پەژارەیی دەرباز دەبێ وە بە مەرامی دڵی دەگات وە ئەگەر بە پێچەوانەی ئەوەوە بێت غەمو پەژارە دەبینێت.

فڕین : ئەگەر کەسێ ببینێ لە قیبلەوە هەڵبفڕێو پاشان لە جێگەکەی خۆی نیشتەوە بە قازانجو سودەوە لەسەفەر دەگەڕێتەوە بە تایبەت ئەگەر ببینێ پەڕوباڵی هەبێ، وە ئەگەر ببینێ بەبێ باڵ بفڕێ گوزەرانی دەگۆڕێت، وە ئەگەر ببینێ لەسەربانی ماڵەکەی خۆی

بۆ سەربانی ماڵێکی تر بفڕێ ژنەکەی تەڵاق دەداتو ژنێکی تر دێنێت یان کەنیزەکێك دەکڕێت.

فیل : هیچ جیاوازییەك نییە لەخەوی شەو وە ڕۆژدا مەگەر فیل ببینێت. ئەگەر کەسێ لەشەودا خەو ببینێ سواری فیل بووبێت لەگەڵ ژنێکی بەد کاردا دەبێتە هاوسەر وە ئەگەر ئەم خەوە لە ڕۆژدا ببینێ ژنەکەی تەڵاق دەدات وە یان کەنیزەکەکەی دەفرۆشێت. ئەگەر ببینێ فیل بکوژێت پاشایەك بە دەستی ئەو دەکوژرێت وە یان قەڵایەکی گەورە بە دەستی ئەو ئازاد دەکرێت. وە ئەگەر ببینێ فیل بیکوژێت مەرگی نزیك بووەتەوە. ئەگەر ببینێ سواری فیل بووبێو کەسێکی تر ئەو فیلەی ببێت لە خزمەتکردنی پاشاکەی خۆی بۆ لای پاشایەکی تر دەڕوات.

فیتنە : ئەگەر کەسێك لە خەویدا ببینێ لە شوێنێکدا فیتنە بەرپا بووبێت ئەوا لەو شوێنەدا گوناح کردنو تاوان پەیدا دەبێت، ئەگەر ببینێ فیتنە ئەما بێت ئەوا خەڵکی ئەو شوێنە ڕوودەکەنە خوای گەورە.

## پیتی ( ق )

**قازی** : ئەگەر کەسێك لەخەویدا بوبێت بەقازی بەڵام شایانی ئەو پلەیە نەبێت ئەوا دوچاری بەڵاو نازارو ئەشکەنجە دەبێت بەڵام ئەگەر بینەری خەوەکە کەسێکی زانا بێت ئەوا دەبێت بە قازی.

**قارچك** : لێکدانەوەی قارچك لەخەودا ژنێکە کە هیچ خێرو سودێکی تیا بەدی ناکرێت، ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ زیاتر لە سێ قارچکی هەبێت ئەوا لە لایەن ژنێکەوە سودو قازانجی پێ دەگات.

**قاچ** : ئەگەر کەسێکی ساڵح و چاکەکار لەخەویدا ببینێ قاچی شەل بێت بەڵگەی لاوازبونی باوەڕەکەی پیشان دەدات وە ئەگەر ببینێ قاچی بە گوریسێکەوە ببەستن لە کەسێکەوە قازانجی پێ دەگات. وە ئەگەر ببینێ قاچی نییە وە بەدارشەق بە ڕێگادا بڕوات بە کەسێکی بێ وەفا پشت نەبەستێت وە ئەگەر کەسێکی لە کاربەدەستانی پاشا بینی هەردو قاچی بڕابێتەوە لەسەر کار لادەبرێ و ماڵ و سامانی بەهەدەر دەڕوات، وە ئەگەر بینی قاچی ئاسنینی هەبێت سەروەتی زیاد دەکات وە ئەگەر بینی قاچی لە زیوو زێڕبێت ماناکەی هەر هەمان شێوەی دەبێت. وە ئەگەر ببینێ قاچی لە کۆت و زنجیردا بێت زیانێکی لێ دەکەوێت، وە ئەگەر ببینێ قاچی بە کۆڵەکەیەکەوە بەسترابێت ماناکەی چاکتر دەبێت. وە ئەگەر بینی قاچی بو بە تەڵە یان داوێکەوە وەیان قاچی بچەقێ لە شوێنێکدا بە ئەندازەی ئەو داوو تەڵەو چەقینە دوچاری گرفتاری و فڕو فێڵ

دەبێتەوە. وە ئەگەر بینی قاچی لە شوێنێکدا بخرێت لە کاری دین‌و دنیا جێ دەمێنێ وە یان کەسێك قسەی پێ دەڵێت کە دەبێتە هۆی ئازاردانی، وە ئەگەر بینی سواری چوارپێیەك بوو وە قاچی خۆی ڕابوەشێنێ مانای ئەوەیە بە مەبەستی گەیشت بە ئامانجی خۆی کەسێکی بە هەوڵ‌و کۆششە.

**قاپی شوشە (چینی)** : لێکدانەوەی قاپی شوشە لەخەودا ژن یان کەنیزەکە خزمەتی دەکەن‌و لە ئامێرەکان‌و پێداویستییە پارێزگاری دەکەن. ئەگەر لەخەودا ببینێ کە قاپی چینی هەیە کەنیزەکێك دەکرێت وە ئەگەر قاپەکە بشکێ کەنیز وەیان ژنەکەی هەڵدێن یان دەمرن.

**قازانگ** : قازانگ لەخەودا کەیبانووی ماڵ ودیان خاوەن ماڵەو هەر عەیب‌و کەم‌و کوڕییەك لە قازانگەکەدا ببینێ بەندە بە خاوەنی ماڵەکەوە. ئەگەر ببینێ لەناو قازانگەکەدا خواردەمەنی‌و گۆشتی تێدابوو بەڵگەی ئەوەیە بژی‌و ئامادەو بێ ئەرکی پێ دەگات، ئەگەر ببینێ قازانگ بشکێ ئەوا کەیبانووی ماڵەکە وەیان خاوەن ماڵەکە دەمرێت.

**قازانگی مسی** : بینینی قازانگی مس لە خەودا خزمەتکاری ماڵە. ئەگەر ببینێ مەنجەڵی مسی بێت ئەوا خزمەتکارەکەی جولەکە دەبێت.

**قاڵب** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ قاڵبی پێڵاوی هەبێت ئەوا خزمەتکارێك پەیدا دەکات، ئەگەر ببینێ قاڵب وون بکات ئەوا خزمەتکارەکەی لێی جیا دەبێتەوە، ئەگەر ببینێ ئەندازدیەکی زۆر

قاڵبی هەبێت ئەوا لە خزمەتکارەکەیەوە سودو قازانجی پێ دەگات بە تایبەت ئەگەر بینەری خەوەکە پینەچی بێت.

**قاڵی** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا قاڵی ڕابخاتو تایبەت بەخۆی بێت ئەوا تەمەنی درێژ دەبێتو بژێوی زیاد دەکات، ئەگەر ببینێ لەسەر قاڵی دابنیشێت بەڵام نەزانێ قاڵییەکە هی کێیە ئەوا وەزعو حاڵی دەگۆڕێت.

**قەلە ڕەش** : ئەگەر کەسی لە خەودا قەلەڕەش ببینێ نیشانەی پیاوی خراپەکارو بێ دینو درۆزنە لەکارەکاندا. ئەگەر ببینێ قەلەڕەش بگرێت وەیان کەسێ پێی بدات لەگەڵ کەسێکی بێ دینو درۆزندا سەرگەرمی کاری پڕوپوچ دەبێت. ئەگەر ببینێ قەلە ڕەشێك بکوژێت ئەوا زاڵ دەبێت بەسەر پیاوی بێ دینو درۆزندا. ئەگەر ببینێ لە جێگەیەکدا کۆمەڵێ قەلەڕەش کۆببنەوە ئەوا کۆمەڵی دزو جەردە لەو جێیەدا کۆدەبنەوە ئەگەر ببینێ بە ئاشکرا قەلەڕەشی گرت لە ڕێگای نادروستەوە سەروەت پەیدا دەکات.

**قەرەوێڵە (تەختەخەو)** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ لەسەر قەرەوێڵەکەدا دابنیشێ وە سەر ئەو قەروێڵەیە فەرش ئەکرابێ بۆ سەفەر دەڕوات وە ئەگەر ببینێ لەسەری خەوتبێ بە پلەوپایە دەگات بە ئەندازەی نرخی ئەو تەختەیە بەسەر دوژمناندا زاڵ دەبێت وە ئەگەر بینەری خەوەکە ئەهلی فەسادو خراپەکاری بێت ئەوا دارکاری دەکرێت بە تایبەت ئەگەر بەسەر تەختەکەوە خەوتبێ وە ئەگەر ببینێ تەختەکە بشکێو بکەوێتە خوارەوە لە پلەوپایەی کەم دەبێتەوەو کاروباری خراپ دەبێت.

قەزوان : لێکدانەوەی ناوکی قەزوان لەخەودا سەروەتە، ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ قەزوانی زۆری هەبێت ئەوا لە لایەن کەسێکی بەخیلو چەکلەوە سودو قازانجی پێ دەگات.

قەسابی : بینینی قەسابی نەناسراو لەخەودا، مەرگە، ئەگەر ببینێ قەسابێك بۆ کۆلانەکەی یان ماڵەکەی بێت ئەوا لەو گەڕەکەدا کەسێك دەمرێت، ئەگەر ببینێ قەسابی بکات بەڵام قەسابی پیشەی ئەو نەبێ ئەوا کەسێك دەکوژێت یان بریندار دەکاتو دوچاری غەمو پەژارە دەبێت.

قەتێو پۆڕ : لێکدانەوەی قەتێ لەخەودا منداڵی نۆکەر یان منداڵی خزمەتکارە، ئەگەر ببینێ قەتێ یان پۆڕی گرت وە یان کەسێ پێی بدات، نۆکەر یان خزمەتکارەکەی منداڵیان دەبێ. وە ئەگەر ببینێ پۆڕیان قەتێ بە دەستییەوە بفڕێو دەربازببێ نۆکەر یان خزمەتکارەکەی دەمرێت.

قەمەی قەسابی : لێکدانەوەی قەمە لەخەودا پیاوێکی دلێرو ئازایە کە کاری ئاسانو سەخت بەلایەوە جیاوازی نییە. ئەگەر ببینێ قەمەی هەبێت وەیان کەسێك پێی بدات ئەوا لەگەڵ ئەو جۆرە پیاوەدا دەبێتە هاوڕێو سودی لێ دەست دەکەوێت. ئەگەر ببینێ قەمەکەی بشکێ وەیان وون ببێ ئەوا لەگەڵ ئەو جۆرە پیاوەدا جیا دەبێتەوە.

قەڵەم : ئەگەر کەسێ لەخەویدا قەڵەمی هەبێت وە یان کەسێك پێی بدات ئەوا دەکەوێتە شوێن زانستو زانیاریو بە ئارەزووەکانی دەگات، ئەگەر ببینێ شتێك بە قەڵەم بنوسێ ئەوا خێرو چاکەکەی

بەندە بەوەی کە دەینوسیٚ وە ئەگەر بە دوو قەڵەم بنوسیٚت گەر کەسیٚکی لە گەشتکردندا بیٚت ئەوا بەزوویی لە گەشتەکەی دەگەڕیٚتەوە.

**قەڵغان (سوپەر)** : ئەگەر کەسیٚ لەخەویدا قەڵغان لەگەڵ چەکیٚکی تردا بەدەستییەوە بیٚت ئەوا کەسیٚك پاریٚزگاری لیٚ دەکاتو پشتو پەنای دەبیٚت. ئەگەر ببینیٚ جگە لە قەڵغان چەکی تری پیٚ نەبیٚت ئەوا کەسیٚکی ناسراوو زانای هەیە بە ئەندازەی گەورەیی ئەو قەڵغانە دۆستانو براکانی لە کارە ناپەسەندو خراپەکان دوور دەخاتەوە.

**قەفەز** : ئەگەر کەسیٚ لەخەویدا قەفەزی هەبیٚت ئەوا لە جیٚگەیەکی تەنگدا زیندانی دەکریٚت وە ئەگەر ببینیٚ قەفەز بشکیٚنیٚ ئەوا لە زیندان ڕزگاری دەبیٚت.

**قرژانگ** : لیٚکدانەوەی قرژانگ لەخەودا پیاوی کینە لەدڵو بەدڕەوشتە، ئەگەر ببینیٚ قرژانگ بگریٚت لەگەڵ پیاویٚکی بەدڕەوشت دا دەبیٚتە هاوڕیٚو سودی لیٚ نەبینیٚ وە ئەگەر ببینیٚ قرژانگی کوشت یان فڕیٚی دا دوردەکەویٚتەوە لە هاوڕیٚیەتی پیاوی بەدڕەوشتو پڕوپوچ وە ئەگەر ببینیٚ گۆشتی قرژانگی خوارد بەو ئەندازەیەی کە دەیخوات بەکاری پڕوپوچ سەرمایە کۆدەکاتەوە.

**قرقی** : ئەگەر لەخەودا قرقی دەستەمۆی بینی کاتیٚك بانگیان کردبیٚت خاوەنەکەی پلەو پایەی بەرز دەبیٚتەوە. ئەگەر ببینیٚ قرقی دەستەمۆی هەبیٚ بەهۆی کەسیٚکەوە بە پلەو پایە دەگات، ئەگەر ببینیٚ قرقی یەکە لە دەستی بەر ببیٚت پلەو پایەی لە دەست دەدات.

قورئان خوێندن : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ ئایاتی ڕەحمەت بخوێنێ ئەوا مزدەی لە لایەن پەروەردگارەوە پێ دەگات‌و پێویستە سوپاسگوزاری بکات بەڵام ئەگەر ئایاتی سزا بخوێنێتەوە ئەوا دەکەوێتە بەر تورەیی پەروەردگار وە پێویستە تۆبە بکات.

قورئان فرۆشتن : ئەگەر کەسێ لەخەویدا قورئان فرۆشی بکات بەلگەی ئەوەیە کەسێکی ناپاکەو پێویستە تۆبە بکات.

قنوت : ئەگەر کەسێ لەخەویدا دوعای قنوت بخوێنێ بەلگەی ئەوەیە بە ئارەزووەکانی دەگات‌و خەڵکی باسی بە چاکە دەکەن.

قوربانی : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ مەڕێك یان ووشترێك بکات بە قوربانی ئەوا ئەگەر بەندەبێت ئازاد دەبێت وە ئەگەر نەخۆش بێت چاك دەبێتەوە وە ئەگەر ئازاد بێت کامەرانتر دەبێت‌و دەچێت بۆ حەج وە ئەگەر ترسی لە شتێك هەبێت ئەوا پارێزراو دەبێت وە ئەگەر هەژارو بێ پارە بێت ئەوا دەوڵەمەند دەبێت‌و ئەگەر ئەم خەونە لە نزیك جەژنی قورباندا ببینێ ئەوا لێکدانەوەی باشتر دەبێت.

قومری : قومری لەخەودا ژنی بێ سۆزو ناسازگارو کەم دینە. ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ قومری هەبێت لەگەڵ ژنی کەم دین‌و بێ سۆزدا هاوسەرگیری دەکات. ئەگەر ببینێ جوجکە قومری هەبێت وە یان گۆشتەکەی بخوات بەو ئەندازەیە سەروەت‌و سامانی دەست دەکەوێت.

. قومار : ئەگەر لەخەودا ببینێ قومار دەکات دوچاری غەم‌و پەژارە دەبێت وە یان گرفتاری فرت‌و فێڵ دەبێتەوە.

قوڕگ : ئەگەر کەسێ لەخەودا قوڕگ ببینێ بەڵگەی ئەمانەتو دینو قەرزارییە. ئەگەر قوڕگی بە ساغی ببینێ بەڵگەی ئەوەیە دەبێتە ئەمانەتدارو قەرزیش بە چاکی دەداتەوە، ئەگەریا ببینی قوڕگی نەخۆش بێت لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت، ئەگەر قوڕگی بە فراوانی ببینێ ئەوا رزقو بژێوی زیاد دەکات، ئەگەر قوڕگی بە تەنگی ببینێ بەڵگەی ئەوەیە ئەمانەت دەگرێتو ئەشتو.

قورقوشم : ئەگەر کەسێ لەخەویدا قورقوشمێ لەهەبێت یان کەسێك پێی بدات ئەوا لەماڵی دنیا شتێکی کەمو بێ بایەخ بەدەست دێنێ. ئەگەر ببینێ قورقوشم بتاوێنێتەوە ئەوا لە نێوان خەڵکیدا ڕسوا دەبێتو سەرزەنشتی دەکەن.

قیامەت : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ قیامەت هەڵسابێت بەڵگەی ئەوەیە خواوەندی گەورە لەو سەرزەمینەدا وێرانو دادپەروەری دەبارێنێ وە ئەگەر خەلکی ئەو سەر زەمینە خراپەکارو گوناحبارێن ئەوا پەروەردگار دوچاری بەلاو موسیبەتیان دەکات وە ئەگەر ستەم لێکراوبن ئەوا زاڵیان دەکات بەسەر ستەمکاراندا.

قیبلە : ئەگەر کەسێ لەخەویدا نوێژی ڕووەو ڕۆژهەلات کرد مانای ئەوەیە حەزی لە دینی ئیسلام نییە، ئەگەر ببینی پشتی لە قیبلە بێتو نوێژ بکات بەڵگەی ئەوەیە لە دینو دنیادا ڕاستگۆ دەبێتو لە پەرستنی خوادا سەرکەوتو دەبێت.

قسەکردن (ئاخاوتن) : ئەگەر لەخەودا ببینێ لەگەڵ کەسێکی چاكو خێرخوازدا قسە بکات ئەوا ژیانی ئەو کەسە پڕ دەبێت لە

خێرو خۆشی وە ئەگەر لەگەڵ کەسێکی فاسدو گوناح باردا قسە بکات لێکدانەوەکەی پێچەوانەیە.

قسە : لێکدانەوەی قسەکردنو بیستنی لەخەودا لەڕووی حاڵەتو زمانەکانەوە جیاوازە.

(قسەکانو زمانەکان)

عەرەبی : لەگەڵ گەورەکانو سەرۆکەکاندا دەبێتە هاوڕێو دانیشتنیان لەگەڵ دەکاتو سودو پلەو پایەی دەست دەکەوێت.

فارسی : لێکدانەوەی وەکو زمانی عەرەبییە.

عیبری : میراتی دەست دەکەوێت.

هیندی : لەگەڵ کەسانی زەلیلو بێ ئەصڵو نەژادا سەروکار پەیدا دەکات.

تورکی : قسەی ناخۆش دەبیسێ وەیان بەدەست کەسێکی بەدکارەوە گرفتار دەبێ.

قبطی : هەواڵ لە ڕیش سپیانی لادێ دەبیسێو دەبێتە هاوڕێیان.

یۆنانی : بە زانستو داناییەوە سەرگەرم دەبێت.

قشقەڵە (قژقەڕە) : لێکدانەوەی قشقەڵە لەخەودا پیاوی پەیمان شکێنو بەدکردارە وە ئەگەر ببینێ قشقەڵەی هەبێ لەگەڵ پیاوی پەیمان شکێندا دادەنیشێو چاوپێکەوتن دەکات.

قیامەت : ئەگەر کەسێ لەخەودا قیامەت ببینێ ئەوا پەروەردگار لەو سەرزەوییەدا دادپەروەریو ڕاستی دەبارێنێ وە ئەگەر خەڵکی ئەو سەرزەوییە تاوانبارو ستەم کاربن ئەوا ئافاتو بەڵا بەسەریاندا دەبارێنێ، ئەگەر خەڵکی ئەو جێیە خەڵکێکی ستەم

لێکراوبن، ئەوا خوای گەورە بەسەر زۆرداران‌و ستەمکاراندا سەریان دەخات. ئەگەر خەڵکی ئەو جێیە لە ڕۆژی قیامەت لە بەردەم پەروەردگاردا ڕاوەستابن ئەوا تورەیی‌و ئەشکەنجەی خودا بەسەر ئەو جێیەدا دەبارێت.

**قیر :** لێکدانەوەی قیر لەخەودا رزق‌و بژێوییە، ئەگەر لەخەویدا قیری هەبێت ئەوا بە ئەندازەی ئەو قیرە سەروەت‌و سامان بەدەست دێنێ، ئەگەر لەخەویدا قیر بخوات مانای ئەوەیە بەو ئەندازەیە ماڵی حەرام دەخوات.

**قیسارە (ئامێری مۆسیقی - چنگ لێدان) :** لێکدانەوەی قیسارە لەخەودا درۆکردنە، ئەگەر ببینێ قیسارە لێ بدات قسەی درۆ دەکات‌و ئازارو غەمی پێ دەگات، ئەگەر بینی پادشا قیسارەی پێ بدات لە لایەن پادشاوە خەڵات‌و گەورەیی پێ دەگات وە ئەگەر لایەنگری سازو ئاوازو قیسارەبێ لە غەم‌و پەژارە دەرباز دەبێت، ئەگەر بینی قیسارەکەی بشکێ یان فرێی بدات، لە قسەی درۆو پڕوپوچ دوور دەکەوێتەوە. ئەگەر ببینێ کەسێ قیسارە لێ بدات‌و ئەویش گوێ بگرێ ئەوا بیسەری قسەی درۆو پڕوپوچ دەبێت.

**قرقێنە :** بینینی قرقێنە لە خەودا، ئەگەر شیرین بێت بەڵگەی سەروەت‌و بژێوییە کە بە ئاسانی بەدەستی دێنی. ئەگەر ترش بێت ئەوا سەروەت‌و بژێوی بە ئازارو ئەشکەنجە بەدەست دێنی.

**قفڵ :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا قفڵ بکاتەوە بەڵگەی ئەوەیە لە کارەکانیدا بەرەو پێش دەڕوات‌و ڕەنگە بڕوات بۆ حەج. ئەگەر ببینێ نەتوانێ قفڵ بکاتەوە لێکدانەوەی پێچەوانە دەبێت.

## پیتی (ك)

**كار** : ئەگەر لەخەودا ببینێ كەوازی لە كارو پیشەی خۆی هێناو سەرگەرمی كارێكی چاكتربو كارو گوزەرانی باشتر دەبێت وە ئەگەر ببینێ كە كارگەلی جۆراوجۆر دەكات وە ئەو كارانە كاری چاكبون بەلگەی چاكییە لە كارەكانیدا وە ئەگەر كارەكان لەخەویدا خراپ بوون بەلگەی خراپییە.

**كار** : ئەگەر كەسێ لەخەویدا ببینێ سەرگەرمی كاروباری دنیایی بێت بەلگەی ئەوەیە كەمو كورتی دێنێ لە ڕۆژی كۆتاییدا بەلام لەخەویدا سەرگەرمی كارەكانی ڕۆژی كۆتایی بێت بەلگەی ئەوەیە پاداشت وەردەگرێتو لە كارەكانی دنیاییدا سەركەوتو دەبێت، ئەگەر ببینێ كارەكانی دنیایی تەواو بوبێت مانای ئەوەیە مەرگی نزیك بۆتەوە وە ئەگەر پێچەوانەی ئەو خەونە ببینێ لێكدانەوەكەشی پێچەوانە دەبێت.

**كارد** : ئەگەر كەسێ لەخەویدا ببینێ كاردێكی بە دەستەوە بێت وە كاردەكەش هی خۆی بێت بەلگەی ئەوەیە كوڕێكی دەبێت، ئەگەر ببینێ لەگەڵ كاردەكەدا چەكی تری پێ بێت بەلگەی ئەوەیە ناودار دەبێت وە هەندێكیش دەڵێن نۆكەرێكی حەبەشی دەكرێت.

**كاروان** : ئەگەر كەسێ لەخەویدا ببینێ لەگەڵ كاروانێكدا بێت بەلگەی ئەوەیە خێرو قازانجی دەست دەكەوێت. ئەگەر بینەری خەوەكە كەسێكی چاكو دروستكاربێت ئەوا دەكەوێتە ناو ئازارو نارەحەتییەوە، ئەگەر بینەری خەوەكە كەسێكی بەدكارو فاسد بێت

ئەوا خێرو چاکە دەبینێت، ئەگەر ببینێ لە کاروانەکەدا بە سواری بڕوات ئەوا بە ئارەزووەکانی دەگات بەڵام ئەگەر بە پیادە بڕوات لێکدانەوەی پێچەوانە دەبێت.

**کاسە** : لێکدانەوەی کاسەدارینە لەخەودا ئەگەر خواردەمەنی تێدابێت مانای ڕزق و ڕۆزی حەڵاڵە لەسەفەردا. ئەگەر کاسەکە بەتاڵ بێت بەڵگەی ئەوەیە بێچارەو دەرماندە دەبێت، هەندێك دەڵێن بینینی کاسە لەخەودا بەڵگەی خزمەتکارێکە کە بەدەستی ئەوە کارگەلێکی چاك ئەنجام دەدرێت وە بینینی کاسەی زیو یان ئاڵتون کە خواردەمەنی تێدابێت مانای بەدەستهێنانی سەروەتی حەرامە وە کاسەی شوشە بەڵگەی ژنە.

**کافر** : ئەگەر کەسێکی کافر لەخەودا ببینێ موسڵمان ببێت بەڵگەی ئەوەیە بە موسڵمانێتی لە دنیا دەردەچێت، ئەگەر ببینێ کافرێك ڕووەو قیبلە نوێژ بکات یان سوپاسگوزاری خوای گەورە بکات بەڵگەی ئەوەیە موسڵمان دەبێت و بژێوی زیاد دەکات.

**کاسەی سیرامیك** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ کەسێك کاسەی سیرامیکی پێ بدات بەڵگەی ئەوەیە قسەیەکی خۆش لەو کەسە دەبیسێ و خۆشحاڵی دەکات ئەگەر ببینێ کاسە سیرامیکەکەی بشکێ بەڵگەی ئەوەیە قسەی ئەو کەسە خراپ و بێ جێ دەبێت، هەندێك لەخەو ناسان دەڵێن لێکدانەوەی کاسەی سیرامیك سێ لایەنی هەیە: یەکەم منداڵ، دووەم: ژن و هاوسەر، سێیەم دۆست و هاوڕێ - بە گشتی لێکدانەوەی کاسەی سیرامیك لەخەودا قسەی خۆشە.

**کاغەز** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا بیبینێت کاغەز بخوێنێتەوە وە لەناو کاغەزەکەدا ناوی خوای گەورەی تێدابێت بەلگەی ئەوەیە بۆ سەر رێگەی راست رێنمونی دەکرێت بەلام ئەگەر لەسەر کاغەز شتی تر نوسرابێت ئەوا بەرپایی‌و خۆپەرستی قسە لەگەلْ خەلکیدا دەکات.

**کانالْ** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ کانالێك هەلبکەنێت، مانای ئەوەیە لەگەلْ خێزان‌و منالەکانیدا رەفتاری فرِوفێلْ دەکات ئەم لێکدانەوەیە بۆ کاتێك دەبێت ئەگەر کەنالەکە ئەگات بەئاو بەلام ئەگەر کەنالەکە گەیشت بەئاو لێکدانەوەکەی هاوسەرگیرییە.

**کانی** : لێکدانەوەی سەرچاوە (کانی) لەخەودا ئەگەر ئاوی خۆش تام‌و سازگاری بوو کەسێکی گەورەو سەخاوەتمەندە وە ئەگەر ئاوەکەی لێلْ‌و بۆگەن بوو بەلگەی غەم‌و پەژارەو ئازارە، ئەگەر ببینێ لەو کانییە مەسحی کرد لە خەم‌و خەفەت دەرباز دەبێت، ئەگەر ببینێ ئاوی کانییەکە زیادی کرد عیزەت‌و پیاو چاکی لەو جێگەیەدا زیاد دەکات وە ئەگەر ئاوی کانییەکە کەم بویەوە لێکدانەوەکەی پێچەوانەیە.

**کاهو** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا کاهوی شیرین بخوات بەلگەی ئەوەیە دوچاری غەم‌و پەژارە دەبێت وە ئەگەر کاهوی تالْی خوارد بەلگەی ئەوەیە زەرەرو زیان دەبینێت.

**کالْــەك** : بینینــی کالْــەك لەخــەودا نەخۆشــیە، کالْــەکی نەگەیوکەشـیرین نــەبێت چـاکترە لەکالْـەکی زەردی گـەیو، بینینــی کالْەکی گەورە چاکترە لەکالْەکی بـچوك وەخـواردنی لەخـەودا زەرەری نیە.

**کەوگیر :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا کەوگیری پاکی هەبێت بەڵگەی ئەوەیە کارەکەرەکەی ژنێکی پاکو خێرخواز دەبێت. ئەگەر کەوگیری بشکێت یان کۆنەو چڵکن بێت لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

**کەرەوز :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ کەرەوز بخوات بەڵام لە وەرزی کەرەوزدا نەبێت ئەوا ئەو کەسە غەمگینو هەژار دەبێت وە هەندێکیش دەڵێین ئەگەر کەرەوز ببینێ بەڵام لێی نەخوات ئەوا غەمو پەژارەکەی کەمتر دەبێت.

**کەری :** لێکدانەوەی کەری لەخەودا هەژاریو تەنگ دەستییە، ئیبن سیرین دەڵێت کەری لەخەودا بەڵگەی ئیمانەو ناکامی بینەری خەوەکە لەکارەکانی دنیایی دایە.

**کەژاوە :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ لەناو کەژاوەدابێتو بەسەر پشتی ئەسپ یان حوشترەوە بێت بەڵگەی ئەوەیە سودو پلەو پایەی دەست دەکەوێت، ئەگەر ببینێ کەژاوەکەی بکەوێتە خوار لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

**کەچەڵ :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ لەگەڵ کەچەڵێکدا قسە بکات ئەوا لەگەڵ کەسێکی گەورەدا دەبێتە هاورێ وە ئەگەر کەچەڵ خەو ببینێ سەری مووی لێ بروێت واتە دەوڵەمەند دەبێتو قەرز دەدات بە خەڵکی.

**کەتان :** لێکدانەوەی کەتان لەخەودا ماڵی حەڵاڵە کە سودەکەی لە سودی لۆکە کەمترە، جلوبەرگی کەتانی لەخەودا چاکو پیرۆزە وە ئەگەر ببینێ تۆوی کەتان بخوات ئەوا ماڵی حەڵاڵ بەدەست دێنێ.

کەتیرە : ئەگەر کەسێ لەخەویدا کەتیرە ببینێ بەڵگەی ئەوەیە بە ئەندازەی ئەو کەتیرەیە لە کەسێکی چەکڵو ڕەزیلەوە سەروەتو سامان بەدەست دێنێ.

کەشك : لێکدانەوەی کەسێ لەخەودا لەگەڵ عەنابو شەکرو وەنەوشەدا کەشك دروست بکاتو لێی بخوات بەڵگەی ئەوەیە ماڵی حەڵاڵ بەدەست دێنێو لە غەمو پەژارە ڕزگاری دەبێت، ئەگەر لەو خواردنە دروستکراوەی نەخوارد لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

کەشتی : ئەگەر کەسێ لەخەویدا سواری کەشتی بوبێت وە بەسەلامەتی لێی دابەزێت ئەوا لەغەمو پەژارە دەرباز دەبێت، ئەگەر کەشتییەکەی تێكو پێك بشکێ ئەوا دوچاری بەڵاو موسیبەت دەبێت، ئەگەر ببینێ لەناو کەشتییەکدا لەگەڵ شتو مەكو کاڵادا بێت بەڵگەی ئەوەیە سەفەر دەکاتو سەروەتی حەڵاڵ بەدەست دێنێ. ئەگەر ببینێ سواری کەشتی بوبێت بەڵام کەشتییەکە ڕاوەستاوبێت بەڵگەی ئەوەیە لە سەفەردا تیا دەمێنێت.

کەر : لێکدانەوەی سواربونی جۆرەکانی کەر بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە:

(کەری ڕەش - پلەو پایە) (کەری سەوز - زاهیدو پارساوپاکی) (کەری سپی - پلەو پایەی دنیایی) (کەری ناوس - ئومێدەواریو زیادبوونی کامەرانی) ئەگەر ببینێ گۆشتی کەر بخوات لە ڕێگای بازرگانییەوە سەروەتو سامان بەدەست دێنێ، ئەگەر ببینێ خۆی کەرەکە بکوژێتو گۆشتەکەی بخوات لەسەروەتو سامانی خۆی خەرج دەکات وە ئەگەر لە کاتی سواربووندا کەرەکەی بمرێت خۆی بە زوویی

دەمرێت، ئەگەر ببینێ کەرەکەی مردبێ ماڵو داراییەکەی لەدەست دەدات. ئەگەر ببینێ لەکەرەکەی بکەوێتە خوارەوە هەژارو بێ پارە دەبێت. ئەگەر ببینێ لە کەرێك کە هی خۆی نەبێ دابەزێو دوبارە سوار ببێتەوە شتێك داوا دەکات کە بە خێرایی دەستی دەکەوێت. ئەگەر ببینێ کەرەکەی خۆی لەگەڵ کەرێکی تردا گۆڕییەوە شیرازەی کاروباری تێك دەچێو دەگۆڕێ.

**کەوا :** ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ کەوایەکی تازەی بە لۆکە چنراوی لەبەردا بێت ئەوا لە غەمو پەژارە ڕزگاری دەبێت، ئەگەر کەوای لە جۆری ئاوریشم یان حەریری لەبەردابێت ئەوا لە کەسێکی گەورەو بەرێزەوە سودو قازانجی پێ دەگات.

**کەری وەحشی :** ئەگەر ببینێ بۆتە خاوەن کەرە وەحشییەك دەستکەوتێکی پێ دەگات. ئەگەر ببینێ سواری کەرە وەحشییەك بووبێو کەرە وەحشییەکە دەستەمۆی بووبێت ئەوا گوناحیکارو بێ دینەو لە دین دوور دەکەوێتەوە. ئەگەر ببینێ کەرە وەحشی لەگەڵیدا شەڕبکات وەیان سەری ڕابکێشێ ئەوا کارێکی پڕ لە ڕەنجو ئازاری پێ دەگات. ئەگەر ببینێ لەگەڵ دوو کەری وەحشیدا شەڕ بکات ئەوا دوو کەسی خراپەکار لەگەڵیدا شەڕ دەکەن وە ئەگەر ببینێ کەرە وەحشییەکی هێنایە ماڵەوە ئەوا پیاوێکی خراپەکار دێنێتە ماڵەوە.

**کەڵەك باز (دەست بڕ)(ساختەچی) :** ئەگەر کەسێ لە خەویدا دەست بڕی کرد، ئەوا کاری پڕوپوچ دەکات ئەگەر ببینێ سەیری دەست بڕێك بکات ئەوا دوچاری کارێکی خراپ دەبێت.

**کەروێشك** : لێکدانەوەی کەروێشك لەخەودا خراپە. ئەگەر ببینێ کەروێشك بگرێت یان کەسێ پێی بدات، کەنیزەکی خراپ ئەکرێ وە یان ژنی خراپ ئەهێنێ، وە ئەگەر ببینێ پێستی کەروێشکی لەبەرکردبێ وە یان گۆشتەکەی بخوات لە لایەن ژنەوە شتێکی ئەندەکی دەست دەکەوێت وە ئەگەر ببینێ بێچووە کەروێشکی هەبوو دوچاری ڕەنجو زەحمەت دەبێتەوە.

**کەو** : لێکدانەوەی کەو لەخەودا ژن یا کەنیزەکێکی جوانە. ئەگەر ببینێ کەو بگرێت ژن دەهێنێ وەیان کەنیزەك دەکڕێت ئەگەر ببینێ گۆشتی کەو بخوات جل‌وبەرگێکی پێ دەبەخشن.

**کەفی دەریا** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا کەفی دەریا ببینێ ئەوا لە لایەن کەسێکی گەورەوە سودو قازانجی پێ دەگات.

**کەمتیار** : کەمتیار لەخەودا بەڵگەی ژنی خراپەکارو ناپاکە. ئەگەر ببینێ کەمتیار لە ماڵی ئەودا ببەستنەوە ژنێکی ناپاك‌و خراپ دەهێنێ وە بە گشتی بینینی کەمتیار لەخەودا خراپە.

**کەلەرم** : لێکدانەوەی کەلەرم لەخەودا سود بردنە لەژنان، لێکدانەوەی کەلەرمی ئامادەکراو باشترە لەکەلەرمی کاڵ، ئەگەر لەخەودا کەلەرم بخوات ئەوا لە لایەن ژنێکەوە سودو قازانجی دەست دەکەوێت.

**کەلەکە** : بینینی کەلەکە لەخەودا ژنە وە ئەگەر بینی کەلەکەی چەپی وەرهەمی کردبێ بەڵگەی ئەوەیە کە ژن‌و کەنیزەکەکەی هەردوکیان پێکەوە حامیلە دەبن وە ئەگەر ببینێ کەلەکەی سوربێتەوەو پارچەیەکی خوێناوی لێ بکەوێتە خوارەوە واتای ئەوەیە

ژنەکەی منداڵی دەبێت بێ ئەوەی کاتی خۆی بێت وە ئەگەر بینی هەردو دەستی خستە سەر کەلەکەی واتای ئەوەیە غەمو پەژارەیەکی گەورەی پێ دەگات.

کەڵەشێر : ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ کەڵەشێری هەبێ وە بزانێت کەڵەشێرەکە هی خۆیەتی، پیاوی عەجەم کە نۆکەری خۆیەتی بەسەریدا زاڵ دەبێ. ئەگەر ببینێ کەڵەشێر بکوژێت بەسەر نۆکەردا زاڵ دەبێ وە ئەگەر ببینێ لەگەڵ کەڵەشێردا شەڕ بکات لەگەڵ پیاوی عەجەمدا دەبێتە هاوڕێ وە ئەگەر ئازاری بە دەست کەڵەشێرەوە بینی لەو پیاوەوە گەزەندەی پێ دەگات. ئەگەر ببینێ کەڵەشێر جوجکەی هەبوو وە یان کەسێ پێی بدات ئەوا کوڕێك یان نۆکەرێکی لە کەنیزەیەك دەبێت. وە ئەگەر ببینێ گوێی لە دەنگی کەڵەشێر بێت ڕێگای چاكو چاکەخوازی هەڵدەبژێرێ.

کەمان : ئەگەر کەسێ لەخەویدا کەمان هەڵبداتو پیاوێك بەن بکات بەڵگەی ئەوەیە داوای کۆمەكو یارمەتی لە کەسێکی گەورە دەکات، ئەگەر کەمانەکە لە جۆری ڕستراوبێت بەڵگەی ئەوەیە داوای یارمەتی لە کەسێکی خواناس دەکات، ئەگەر کەمان هەڵبدات بەڵام کەسی نەگرت ئەوا ئەو کەسە هیچ یارمەتیەکی نادات.

کەمەربەند : ئەگەر کەسێ لەخەویدا کەمەر بەند ببەستێ ئەوا بە ئەندازەی نرخی ئەو کەمەربەندە سەروەتی دەست دەکەوێتو هەروەها منداڵەکانی دەبنە پشتیوانی، ئەگەر کەمەر بەندی بە گەوهەر ڕوکەشکراوی لە کەمەری ببەستێ بەڵگەی ئەوەیە

سەروەت‌و سامان بەدەست دێنێت هەندێکیش دەڵێن کوڕێکی دەبێت کە فەرمانڕەوایی‌و سەرۆکایەتی خێڵەکەیان دەگرێتە ئەستۆ.

**کەنو** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا کەنویەك هەنگی هەبێت ئەوا بە ئارەزووەکانی دەگات‌و ماڵی حەڵاڵ بەدەست دێنێ.

**کەنیزەك** : لێکدانەوەی کەنیزەك لەخەودا، ماڵ‌و ئارەزووە، ئەگەر لەخەودا کەنیزەك بکڕێت ئەوا سەروەت بەدەست دێنێ، ئەگەر کەنیزەکەی بفرۆشێ ئەوا لەسەروەتەکەی کەم دەبێتەوە.

**کەوتن** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ بەڕودا بکەوێت ئازایەتی‌و نیگەرانی پەیدا دەکات بەتایبەتی لەجەنگ‌و ناکۆکیدا، وە ئەگەر ببینێ لەجێگەیەکی بەرز وەکو شاخ وەیان درەخت وەیان دیوارێك بکەوێتە خوارەوە بە ئارەزووەکانی خۆی بە شێوەیەکی تەواو ناگات وە مەرامەکانی نایەتەدی.

**کەوان** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا تیروکەوانی بە دەستەوەبێت ئەوا لە سەفەردا سودو قازانج دەبینێت. ئەگەر کەسێ کەوانی پێ بدات بەڵگەی ئەوەیە کوڕ یان برایەکی دەبێت، ئەگەر بە کەوان تیر بهاوێژێ قسەی حەق‌و پوچ دەکات، ئەگەر کەوانی دا بە کەسێکی تریان بیفرۆشێت یان لەناو بچێت ئەوا ژنەکەی تەڵاق دەدات.

**کەوانی هەلاجی** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا کەوانی هەلاجی هەبێت بەڵگەی ئەوەیە کەسێکی دوڕووەو هەندێکیش دەڵێن لەگەڵ ژنێکی سەرەڕۆو بێ گوێدا هاوسەرگیری دەکات، ئەگەر کەوانی هەلاجی وون بکات بەڵگەی ئەوەیە لەو جۆرە ژنە جیا دەبێتەوە.

کشمیش : ئەگەر کەسێ لەخەویدا کشمیشی هەبێت‌و لێی بخوات ئەوا بەو ئەندازەیەی کە دەیخوات سودو قازانج بەدەست دێنێ بەڵام ئەگەر کشمیش بەکەسێك بدات بەڵگەی ئەوەیە خزمەتێك بەو کەسە دەکات.

کرێکاران : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ ژمارەیەك کرێکار لە ماڵەکەیدا کار بکەن بەڵگەی ئەوەیە لەگەڵ کەسێکدا شەڕ دەکات، ئەگەر ببینێ لەماڵی یەکێکدا کرێکاری بکات بەڵگەی ئەوەیە لە کارێکدا دوچاری گرفت دەبێت‌و خاوەن ماڵەکەش دوچاری شەڕو ناکۆکی دەبێت، ئەگەر ببینێ کرێکاران خۆڵ لە ماڵەکە بەرنە دەرەوە لێکدانەوەکەی پیچەوانە دەبێت.

کچ : کچ لەخەودا بەڵگەی شادی‌و سەروەری دنیایە. ئەگەر ببینێ کچێکی ببێ وەیان کەسێك کچێکی پێ ببەخشێ بە ئەندازەی جوانی ئەو کچە خێرو بەرەکەت‌و سەروەت بەدەست دێنێ. ئەگەر ببینێ کچەکەی بمرێت لێکدانەوەکەی پێچەوانەیە.

کونجی : لێکدانەوەی کونجی لە خەودا ماڵی حەڵاڵە هەمو ڕۆژێك ڕو لە زیادبونە، ئەگەر ببینێ ئەندازەیەکی زۆر کونجی هەبێت ئەوا بەو ئەندازەیە سەڕوەت‌و سامانی دەست دەکەوێت.

کولەکە : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ لەماڵەکەیدا کولەکە بڕوێت وە لە وەرزی خۆیدا بێت بەڵگەی ئەوەیە پلەوپایەی بەرز دەبێتەوە وە ئەگەر کەسێکی نەخۆش ئەو خەوە ببینێ چاك دەبێتەوە، ئەگەر بەندەیەك ئەو خەوە ببینێ ئەوا ئازاد دەبێت وە ئەگەر کافریش بێت ئەوا موسڵمان دەبێت وە ئەگەر گەشتیارێك ئەو

خەوە ببینێ دەگەڕێتەوە بۆ وولاتەکەی خۆی وە ئەگەر گوناحکار بێت تۆبە دەکات.

**کورسی** : لێکدانەوەی کورسی لەخەودا زانستو ئیمانە.

**کوشتن** : ئەگەر کەسێك لەخەودا ببینێت بیکوژن بەڵگەی ئەوەیە تەمەنی درێژ دەبێت، ئەگەر لەخەودا کەسێك بکوژێت بەڵام سەری لەلاشەی نەکردەوە بەڵگەی ئەوەیە سودو قازانجێك بەو کەسە دەگەیەنێت.

**کولیچە** : لێکدانەوەی کولیچە لەخەودا بەڵگەی ژیانێکی خۆشو کامەرانییە، ئەگەر لەخەودا کولیچە بخوات ئەوا سەروەتو سامان بەدەست دێنێ، ئەگەر کولیچە بخاتە نێو دەمییەوە بەڵام نەتوانێت بیخوات بەڵگەی ئەوەیە ئەو سەروەتەی کە هەیەتی هی کەسێکی ترە.

**کون** : ئەگەر ببینێ لە کێوێکدا کونێك هەبێتو بچێتە ناو ئەو کونەوە ئەوا لە جفرەو ڕازەکانی پادشا ئاگادار دەبێت. ئەگەر شتێکی لەو کونەدا دەرهێنا ئەوا بە ئەندازەی ئەو شتە لە لایەن پاشاوە خەڵات دەکرێت، ئەگەر ببینێ زەوی کون ببێ ئەوا کەسێك ئاگای لە ڕازەکانی دەبێت. ئەگەر ببینێ لەشی کونێکی تێدابێتو لەو کونەوە خوێن هاتە دەرەوە ئەوا زەرەرو زیانێك دەکات، ئەگەر سوێندی درۆی خوارد ئەوا لێکدانەوەی پێچەوانەی دەبێت مەگەر تۆبە بکات تا ڕزگاری ببێ. ئەگەر بینی سوێندی خوارد ئەوا دەکەوێتە ناو قەرزی وام (سولفە)و قەرزی خەڵکییەوەو دوچاری غەمو پەژارە دەبێتەوە لەلایەن پاشاوە.

**کوێر** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا کوێر ببێت بەڵگەی ئەوەیە بێ دین دەبێ، ئەگەر یەك چاوی کوێر ببێ ئەوانیوەی دینەکەی لەدەست دەدات‌و گوناحێکی گەورە دەکات‌و پێویستە تۆبە بکات.

**کیسە** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا کیسەیەك پارە پەیدا بکات ئەوا بە ئەندازەی ئەو کیسەیە بژێوی زیاد دەکات بەڵام ئەگەر کیسەکە بەتاڵ بێت ئەوا لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت‌و هەندێکیش دەڵێن مردنی نزیك بۆتەوە.

**کێو** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا بەسەر کێوێکەوە بانگ بدات یان نوێژ بکات ئەوا کاروباری چاك دەبێت، ئەگەر لە دامێنی کێوەکە شوێنێك دروست بکات یان لە کێوەکە بکەوێتە خوارەوە ئەوا دوچاری غەم‌و پەژارە دەبێت.

**کۆت کردن** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ کە زنجیرو کۆت لەقاچی دابێت ئیمان‌و باوەڕی ئەو کەسە ناتەواوەو ئەو کەسە بە درۆوە خۆی بە موسڵمان دەزانێت وە کەسێکی بەخیل‌و چەکلەو هیچ شتێکی لەدەست نابێتەوە.

**کۆڵان** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا بچێتە کۆڵانێکی خۆش‌و ئاوەدانەوە ئەوا سودو قازانجی پێ دەگات،بەتایبەت ئەگەر خەڵکی ئەو کۆڵانە کەسانێکی خواناس بن، ئەگەر خەڵکی کۆڵانەکە کەسانێکی خراپ بن ئەوا زەرەرو زیان دەبینێت.

**کفن** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا کفن بۆ مردویەکی ناشنا دروست بکات دوچاری ئازارو ئەشکەنجە دەبێت، ئەگەر کفن لە مردوەکە بکاتەوە پارێزگاری لێ دەکات، ئەگەر کفنی مردوەکان دابکەنێت ئەوا

له مردووه ماڵی حەرام بەدەست دێنێ، ئەگەر بینەری خەوەکە کەسێکی فاسدو خراپەکاربێت جەختی دەکاتەوە کە کەسێکی بەدکردترو دوڕووە.

**کێڵگە** : لێکدانەوەی کێڵگە لەخەودا ئەگەر کێڵگەکە ناسراو بێت بەڵگەی منداڵی خەڵکییە. ئەگەر کێڵگەیەك درەو بکات ئەوا هەندێك خەڵکی لەو شوێنەدا دەکوژرێن.

**کتێب** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا کتێب بخوێنێتەوە بەڵگەی ئەوەیە رێگەی دینی پەروەردگار هەڵدەبژێرێت وە لە کارەکانیدا بەرەو پێش دەچێت، ئەگەر کتێبی هەواڵو باسو خواس بخوێنێتەوە ئەوا نزیك دەبێتەوە لە پاشا، ئەگەر کتێبی شەریعەت بخوێنێتەوە ئەوا لە کارە ناپەسەندەکان دەست هەڵدەگرێت. ئەگەر کتێبی بنەما دینیەکان بخوێنێتەوە ئەوا سەرگەرمی کارێك دەبێت کە سودو قازانجی لێ دەکات، ئەگەر کتێبی چیرۆك بخوێنێتەوە ئەوا حەزو ئارەزو پەیدا دەکات بۆ فێربون لە ژیانی پێغەمبەران، ئەگەر کتێبی سەرگوزشتەی پاشاکان بخوێنێتەوە ئەوا سەرزەنشت دەکرێت، ئەگەر کتێبی حیکمەت بخوێنێتەوە ئەوا سەرگەرمی قورئان خوێندن دەبێت، ئەگەر کتێبی رێزمانەوانی بخوێنێتەوە ئەوا سەرگەرمی کاروبارەکانی دنیایی دەبێت.

**کڕینو فرۆش** : لێکدانەوەی کڕینو فرۆش لەخەودا خراپە. ئەگەر ببینێ کەسێك بیفرۆشێ حاڵو ئەحواڵی ئاڵۆز دەبێتو پەژموردە دەبێت.

کلیل : لێکدانەوەی کلیل لەخەودا کە گرفتەکانی خەڵکی چارەسەر دەکات هەروەها بەڵگەی زاڵبونو سەرکەوتنیشە، ئەگەر کەسێ لەخەودا کلیلی زۆری هەبێت بەڵگەی ئەوەیە پلەو پایەی زیاد دەکات.

کڵاو : لێکدانەوەی کڵاو لەخەودا پلەوپایەیە، ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ کڵاوێکی تایبەتی لەسەردابێت ئەوا لێپرسیارییەکی لەلایەن پاشاوە پێ دەسپێردرێت.

کڵاو خودە (کڵاوی سەربازی) : بینینی کڵاو خودە لەخەودابەڵگەی شتێکە بە فروفێڵ پارێزگاری لەخۆی بکات پێی. ئەگەر کڵاوی پۆڵایی لەسەردابێت ئەوا بە ئەندازەی چاکیو بەنرخی ئەو کڵاوخودەیە پلەو پایەی دەست دەکەوێت، ئەگەر کڵاو خودە لەسەری دابگرێت ئەوا لە پلەوپایەی کەم دەبێتەوە.

کڵێسا : ئەگەر کەسێ لەخەودا بچێتە کڵێسا بەڵام ڕووەو قیبلەی موسڵمانان نوێژ بکات بەڵگەی ئەوەیە تۆبە لە گوناحەکانی دەکاتو دینەکەی توندو تۆڵ دەبێت چونکە کڵێسا شوێنی خوا پەرستییە.

کراس : کرمانی دەڵێت : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ کراسی تازە لەبەر بکات بەڵگەی ئەوەیە کە ڕوکەشێکی چاکی دەبێو ناوەڕۆکی خراپ وە ئەگەر ببینێ کراسو شەرواڵی کۆنەو پیسی لەبەردا بێت، ئەگەر دەوڵەمەند بێت هەژار دەکەوێت وە لە غەمو پەژارەو گرفتاریدا دەبێت.

**کەرکەس*** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ کەرکەسی هەبێ بە پلەو پایە دەگات وە لێکدانەوەی نیسقان‌و گۆشتی کەرکەس هەر هەمان شتە.

**کرێش** : ئەگەر ببینێ کرێش لەسەری بوەرێت ئەوا بە ئەندازەی ئەو کرێشە لەلایەن کەسێکەوە ئازارو بەلای پێ دەگات. ئەگەر ببینێ کرێشی سەری نەمێنێ ئەوا لە بەڵاو ئازارو پارێزراو دەبێت. ئەگەر ببینێ لەگەڵ کرێشی سەریدا قژی پاك بێتەوە ئەوا لەغەم‌و پەژارە دەرباز دەبێت.

**کەم ئەندامی** : ئەگەر کەسێ لەخەودا لەشی کەم ئەندامیەکی هەبێت بەڵگەی ئەوەیە بەو ئەندازەیە لەسەروەتی کەم دەکات جگە لە کەم‌وکورتی لە زماندا چونکە لێکدانەوەی کەم‌وکورتی لەزماندا لێکدانەوەکەی چاکەیە، ئەگەر ببینێ لەسەروەتی دا کەم‌و کورتی هەبێت بەڵگەی ئەوەیە دوچاری نیگەرانی دەبێت.

**کێشانە** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ترازویەکی بەدەستەوەبێت‌و شتێك کێشانە بکات، بەڵگەی ئەوەیە لەنێوان خەڵکیدا قەزاوەت‌و دادوەری دەکات، ئەگەر ببینێ شتێکی توندو تۆڵ هەڵ بگرێت‌و کێشانەی بکات، ئەگەر بینەری خەوەکە مەلا بێت بەڵگەی ئەوەیە دەبێت بە قازی وە ئەگەر مەلا نەبو بەڵگەی ئەوەیە بۆ کاری قەزاوەت کردن کاری دەکەوێتە لای قازی.

**کشتوکاڵ** : لێکدانەوەی کشتوکاڵی‌و جوتیاری لەخەودا پشت بەستنە بە خوای گەورەو بەدەست هێنانی بژێوی حەڵاڵە.

---

* (کەرکەس)ە : ((جۆرێك باڵندەیە شێوەی لە واشە دەچێت)). وەرگێر

**كولله** : بينينى كوللەى زيندو لەخەودا ماڵو سامانەو كوللەى پاككراو دينارو درهەمە. ئەگەر ببينێ لە شوێنێكدا كولله پەيدا ببێتو زيان بگەيەنێت لەشكرێك بۆ ئەو شوێنە دێتو كاولى دەكات.

**كونەپەپو** : لێكدانەوەى كونەپەپو لەخەودا پياوى دزو حەسودو تەماعكارە. ئەگەر ببينێ لەگەڵ كونەپەپودا شەڕى كرد لەگەڵ پياوێكدا شەڕ دەكات. بە گشتى بينينى كونەپەپو لەخەودا لە هەموو كاتێكدا خراپە.

**كورسى** : ئەگەر لەخەودا ببينێ كورسى هەبێت ئەوا خەڵكى تاريفى لێ دەكەنو سوپاسو ستايشى دەكەن. ئەگەر ببينێ كورسى سپى هەبێت بەڵگەى ئەوەيە لە لايەن كەسێكى گەورەوە سودو قازانجى پێ دەگات.

**كۆشك** : ئەگەر كەسێ لەخەويدا بچێتە ناو كۆشكێكەوە ئەوا سەروەتو سامانێ بەدەست دێنێ بە تايبەت ئەگەر ئەو كۆشكە لەگڵ يانێ خشت دروست كرابێت، ئەگەر ببينێ كۆشكەكە لە گەچو بەرد دروست كرابێت ئەوا سەروەتو سامانى دەست دەكەوێت بەڵام وێنەكەى لاواز دەبێت.

**كردنە باوەش** : كرمانى ئەڵێت : ئەگەر كەسێك لەخەودا بينى كەسێكى ناسراو لەباوەش بكات ئەگەر چاكەخوازو دروستكاربێت لەو كەسەوە سودى دينى دەست دەكەوێت وە ئەگەر ببينێ منداڵێكى لەباوەش كرد حەز لە خۆشەويستىو سۆزى منداڵ دەكات وە ئەگەر ببينێ شێرێكى لەباوەش كرد لەگەڵ دوژمنەكەيدا ئاشتى دەكات.

**کۆتر** : لێکدانەوەی کۆتر لەخەودا ژنە. ئەگەر ببینێ کۆتر بگرێت ومیان کەسێ پێی بدات ژن دەهێنێ وە ئەگەر ببینێ گۆشتی کۆتر بخوات ئەوا سەروەتی ژن دەخوات، ئەگەر ببینێ کۆتری دزیو فرێیدا بۆ جێیەك قسەیەك کەوتۆتە شوێن ژنەکەی بەتەلاقدانی دەدات. ئەگەر ببینێ کۆمەڵێ بێچووە کۆتری هەبێ لە لایەن ژنانەوە سودی پێ دەگات.

**کۆکە** : ئەگەر ببینێ لەکاتی کۆکەکردن دا بەڵغەمی فڕێدا ئەوا لەو ئازارو بەڵاو ئەشکەنجەیەی کە بە سەریدا هاتووە یان ئەو پارەیەی کە وونی کردووە لەلای کەسێکدا شکات دەکات. ئەگەر ببینێ لەکاتی کۆکەکردندا سەفرای هەڵهێنایەوە ئەوا کەسێکی ناپەسەندەو خەڵکی شکاتی لێ دەکەن. ئەگەر ببینێ لەپاڵ کەسێکی گەورەدا بکۆکێ ئەوا لە لای سەرۆکدا شکات دەکات. ئەگەر ببینێ بە هێواشی بکۆکێ خەمخۆری دینە.

**کۆیلە فرۆشی** : ئەگەر کەسێك لەخەودا ببینێ کۆیلە فرۆشی بکات بەڵگەی ئەوەیە کە درۆی زۆر دەکات.

**کۆتو زنجیر** : لێکدانەوەی کۆتو زنجیر لەخەودا بەڵگەی حەزکردنە لە کافری، ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ کۆتو زنجیر لە گەردنی کرابێت بەڵگەی ئەوەیە بەدرۆ خۆی بە موسڵمانی نیشان دەداتو بە کافری لە دنیا دەردەچێت.

**کۆڵەکە** : لێکدانەوەی کۆڵەکە لەخەودا خاوەن ماڵو خۆش بەختە. ئەگەر ببینێ کۆڵەکەی ڕاستو بەهێزی ببێ ئەوا لە کەسێکی سەرمایەدار پلەو پایەو قازانج بەدەست دێنێ. ئەگەر ببینێ کۆڵەکەی بشکێ یان بسووتێ ئەوا ئەو کەسە لەدنیا دەردەچێت.

**کۆم** : لێکدانەوەی بینینی کۆم لەخەودا کارو کاسبیە، ئەگەر ببینێ کۆمی هاتبێتە دەرەوە بەڵگەی ئەوەیە کاروباری ڕو لەخراپییە، ئەگەر ببینێ خوێن لە کۆمی بێتە دەرەوە بەڵگەی ئەوەیە زەرەرو زیان دەبینێت، ئەگەر لەکۆمی کرم یان پارچە گۆشت بێتە دەرەوە بەڵگەی ئەوەیە منداڵەکەی دەمرێت. ئەگەر کۆمی برینی لێ بێت بەڵگەی ئەوەیە بەهۆی پارەوە دوچاری غەمو پەژارە دەبێت.

**کێچ** : کێچ لەخەودا دوژمنی لاوازە، ئەگەر ببینێ کێچ لەشی بگەزێ لە لایەن دوژمنەوە قسەیەکی ناخۆش دەبیسێ. ئەگەر ببینێ کێچ بکوژێ دوژمن تێك ئەشکێنێ. ئەگەر ببینێ کێچی زۆر بداتە لەشی ئەوا خەڵکی نەفام قسەی ناخۆشی پێ دەڵێنو ئازارو زیان دەبینێ.

**کلك** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ کەوەك ئەسپو کەر یان مانگا کلکی هەبێت ئەوا سەروەتو سامانی زیاد دەبێت بەخۆشیو کامەرانی ژیان دەکات بەڵام لە کاروباری دینیدا سستو تەمەڵ دەبێت.

**کنگر** : ئەگەر کەسێ لەخەودا کنگری هەبێتو لێی بخوات ئەوا دوچاری غەمو پەژارە دەبێت بەڵام ئەگەر لێی نەخوات دوچاری پەژارە نابێت.

**کیسەڵ** : لێکدانەوەی کیسەڵ لەخەودا پیاوی زانایە کە چاوپێکەوتنی بۆ خەڵکی سودو قازانجی تێدایە، ئەگەر ببینێ کیسەڵ بۆ ماڵەکەی بێت لەگەڵ کەسێکی پارسادا دادەنیشێ وە ئەگەر گۆشتی کیسەڵی خوارد بەو ئەندازەیە زانست فێر دەبێت.

## پیتی ( گ )

**گا :** ئەگەر لەخەودا ببینێ مانگای قەڵەوی هەبێ وە بزانێ کە هی خۆیەتی لەو ساڵەدا سەروەتو سامانی زۆر بەدەست دێنێ، وە ئەگەر مانگای لەڕی بینی لێکدانەوەکەی پێچەوانەیە. وە ئەگەر ببینێ مانگا بدۆشێتو شیرەکەی بخواتەوە سەروەتو سامانی زیاد دەکات. وە ئەگەر ئەم خەوە (بەندەیەك) ببینێ ئازاد دەبێت، ئەگەر کەسێ زەلیلو ناڵەبار ئەم خەوە ببینێ ئازیزو خۆشەویست دەبێت. ئەگەر لەخەودا ببینێ مانگاکەی ئاوس بێت ئەوا ئومێدەواری پەیدا دەکات. ئەگەر ببینێ گایەکی قەڵەو بکرێت ژنێکی دەوڵەمەند دەهێنێ. ئەگەر ببینێ مانگایەك بکرێتو لەگەڵی قسە بکات ئەوا ژیانی لەهەموو بوارەکاندا بەرەو پێش دەڕوات. وە ئەگەر ببینێ لەگەڵ مانگایەکدا شەڕ بکات وە مانگاکە گازی لێ گرت ئەوا خیانەت بە ژنەکەی دەکات وە ئەگەر ببینێ مانگایەك هاتە ماڵەکەی سەروەتو سامان بەرەو ڕووی دێت.

**گامێش :** لێکدانەوەی گامێش لەخەودا پیاوی دەوڵەمەندە وە لێکدانەوەکانی تری گامێش وەکو مانگایە.

**گاور :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببێت بە گاور بەڵگەی ئەوەیە خوازیاری ماڵی دنیایە.

**گازگرتن :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ یەکێك گازی لێ بگرێت ئەوا بە ئەندازەی ئەو گازە زیان دەبینێ، ئەگەر کەر گازی لێ بگرێ ئەوا گلۆڵەی دەکەوێتە لێژی، ئەگەر گا گازی لێ بگرێت ئەوا

لەو ساڵەدا ڕەنج‌و ئازار دەبینێت، گازو قەپ لێگرتنی جانەوەرو ئاژەڵ لەخەودا بەڵگەی زەرەرو زیانە.

گەدە : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ گەدەی ساغ‌و سەلامەت بێت ئەوا بەڵگەی ئەوەیە تەمەنی درێژ دەبێت، ئەگەر پێچەوانەی ئەوە ببینێ تەمەنی کورت دەبێت.

گەدایی : ئەگەر کەسێ لەخەویدا گەدایی بکات‌و خەڵکی پارەی پێ بدات ئەوا خێرو بەرەکەتی دەست دەکەوێت.

گەچ : لێکدانەوەی گەچ لەخەودا جەنگ‌و دوژمنایەتییە، ئەگەر گەچ بفرۆشێ لێکدانەوەکەی خراپە.

گەردن (مل) : ئەگەر کەسێ لەخەویدا بارێکی قورسی بە ملەوە بێت بەڵگەی ئەوەیە نەخۆش دەکەوێت، ئەگەر بارێکی قورسی بە ملەوە بێت بەڵام هیچ هەست بە ماندویی نەکات بەڵگەی ئەوەیە تەمەنی درێژ دەبێت‌و دینی توندو تۆڵ دەبێت.

گەردن بەند (ملوانکە) : ئەگەر کەسێ لەخەویدا گەردن بەندی هەبێت ئەوا خوای گەورە فێربونی قورئانی ئەو کەسە زیاد دەکات، هەرچەند گەردن بەندەکە گران بەهاتربێت ئەوا زانستی زیاتر دەبێت.

گەنە : لێکدانەوەی گەنە لەخەودا زیانە، ئەگەر کەسێ ببینێ گەنە لەشی بخوات بەو ئەندازەیە لە ماڵ‌و سامانی کەم دەبێتەوە. ئەگەر ببینێ لەشی چوار پێکەی گەنە تێی دابێ خەڵکی لە چوا پێکەی کەڵك وەردەگرێ.

گەڕان : ئەگەر کەسێ لەخەویدا لە جێگەیەکدا بگەڕێ، لەو گوزەرانەی کە تێیدایە گوزەرانی چاکتر دەبێت وە ئەگەر گەڕانەکەی زۆربوو بۆ سەفەرێکی درێژخایەن دەڕوات وە ئەگەر بەهۆی نێزە یان دارێکەوە بەرزبێتەوە بۆ جێگەیەکی تر بڕوات پشت بە پیاوێکی بەهێز دەبەستێت تا یارمەتی بدات بۆ ئەوەی بە مەبەستی کارەکەی بگات، ئەگەر ببینێ بەسەر دیوارێکدا سەربکەوێتو بچێتە سەر پشتی ئەسپ یان وولاخێكو دانیشێ ئەوا دەمرێت ئەگەر ببینێ بە هەوادا بڕواتو خانووی ژێرپێی ڕۆچوو بەڵام نەمرد هاوسەرەکەی لێی جیا دەبێتەوە بەڵام دوبارە دەگەڕێتەوە بۆلای، ئەگەر ببینێ لەکاتی ڕێ ڕۆشتنی بە ئاسماندا ڕووی بۆ قیبلە وەرچەرخاندو خۆی لە مەککەو مەدینە بینیەوە بۆ حەج دەچێت.

گەڕی : لێکدانەوەی گەڕی لەخەودا سەروەتو سامانە، ئەگەر ببینێ شوێنێکی لەشی بخورێنێت و گەڕبوبێت ئەوا سەروەتو سامان بەدەست دێنێ، ئەگەر لەشی گەڕییە ڕەشەشی بگرێت لێکدانەوەکەی هەروەکو لای سەرەوە دەبێت.

گەڵا : بینینی گەڵا لەخەودا کە بە درەختەوە بێت خوو ڕەوشتی بینەری خەوەکەیە بە تایبەت ئەگەر لە وەرزی گەڵادا بێت، وە ئەگەر ئەندازەیەك گەڵای سەوزی لە درەختێك کردەوە یان کەسێك پێی بدات بینەری خەوەکە ڕەوشت جوانە.

گەنج (ژێر خاکی) : ئەگەر کەسێ لەخەویدا گەنج بدۆزێتەوە، نەخۆش دەکەوێت، ئەگەر ببینێ گەنج وون بکات لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت

گەنج بونەوە : ئەگەر کەسێ لەخەویدا گەنج بویەوەو ڕیشی سپی دوبارە ڕەش بویەوە ئەوا خراپو مایە پوچ دەبێت، ئەگەر لاوێکی نەناسراو ببینێ ئەوا بەدەست دوژمنەوە زەلیلی دەبینێ بە ئارەزووەکانی ناگات، ئەگەر ببینێ لاوێك پیر ببێ ئەوا پلەو پایەی زیاد دەکات ژنانیش لە لێکدانەوەی ئەم خەوەدا وەکو پیاوانن.

گەنم : لێکدانەوەی گەنم لەخەودا، بژێوی حەڵاڵە کە بە ناڕەحەتی دەست دەکەوێت، ئەگەر گەنمی پاککراو بخوات بەڵگەی ئەوەیە خەفەت بارو خەمگین دەبێت. ئەگەر ببینێ سکی لە خوارەوە تا دەمی پڕبێت لەگەنم، بەڵگەی ئەوەیە بەزوویی دەمرێت.

گسك : لێکدانەوەی گسك لەخەودا خزمەتکارە، گسکی گەورە لەخەودا خزمەتکارێکە کە داوای شتانێکی گەورە دەکات. ئەگەر ببینێ ماڵەکەی گسك لێ بدات، ماڵەکەی لەناو دەچێت وە ئەگەر ببینێ ماڵی کەسێك گسك لێ بدات سامانو ماڵی کەسێکی پێ دەگات بە تایبەت ئەگەر ببینێ کە خاكو خۆڵی ئەو ماڵە بۆ ماڵەکەی خۆی بهێنێ.

گەوهەر : بینینی گەوهەر لەخەودا ژنی سەرمایەدارو جوانە، ئەگەر ببینێ گەوهەری هەبێ لەگەڵ ژنێکدا هاوسەرگیری دەکات، ئەگەر ببینێ گەوهەری وون ببێ ئەوا ژنەکەی تەڵاق دەدات.

گرێ : ئەگەر لەخەودا گرێ بدات لە پەتێك بەڵگەی ئەوەیە پشت بەکارێك دەبەستێت، ئەگەر شتێك بە توندی گرێ بدات یان بیبەستێ، ئەوا کارەکانی بەبێ بەست دەکات، هەرچەن گرێکە

توندتربێت ئەوا بن بەستەکە زیاتر دەبێت، ئەگەر نەتوانێ گرێ بکاتەوە ئەوا کارەکانی ئاڵۆز دەبن‌و بە بن بەست دەگات.

**گردۆڵکە :** ئەگەر ببینێ لەسەر کێوێك یان گردێك دانیشتبێ لەکەسێکی پلەوپایەدار کە پلەوپایەکەی بە ئەندازەی ئەو کێوو گردەبێت لە پێشتر دەبێ وە ئەگەر ببینێ لەسەر تەپۆلکەیەکدا ڕابوەستێ بۆ لای پیاوێکی گەورە دەڕوات وە لەو کەسەشدا ڕێزو ئیحترام‌و سەروەت بەدەست دێنێ وە ئەگەر ببینێ ئەو تەپەیە موڵکی خۆیەتی بەسەر پیاوێکی گەورەدا زاڵ دەبێت‌و سەروەت‌و سامانی بۆ خۆی دەبات‌و لە جێگەیەکدا دادەنیشێ وە ئەگەر ببینێ لە تەپۆڵکە یان گردەوە کەوتە خوارێ یان کەسێك خستییە خواردوە بەهۆی پیاوێکی گەورەوە بێ ڕێز دەبێت‌و ئابڕوی دەچێ‌و بەدەستییەوە ئازار دەبینێ وە ئەگەر ببینێ بە نارەحەتی‌و زەحمەتەوە بۆسەر ئەو تەپەیە بڕوات دوچاری غەم‌و پەژارەو دەردی سەری دەبێت.

**گریان‌و لاواندنەوە :** ئەگەر کەسێ لەخەودا گریان‌و لاواندنەوە ببینێ بەڵگەی ئەوەیە خەڵکی ئەو شوێنە پەرتەوازە دەبن، ئەگەر ببینێ دەسەڵاتداری ئەو شوێنە بمرێت‌و خەڵکی بیلاوێننەوە بەڵگەی ئەوەیە دەسەڵاتداری ئەو شوێنە زەرەرو زیان دەکات.

**گێزەر :** بینینی گێزەر لەخەودا، غەم‌و پەژارەیە، ئەگەر ببینێ لەخەودا گێزەر بخوات بەڵگەی ئەوەیە دوچاری غەم‌و پەژارە دەبێت.

**گریان :** لێکدانەوەی گریان لەخەودا شادی‌و خۆشحاڵییە لەلایەن خوای گەورەوە ئەگەر لەخەودا لەبەر گوناح بگری وە یان لە کۆڕی پرسە یان لە کاتی قورئان خوێندندا بگری ئەوا پەروەردگار

ڕەحمەتی بەسەردا دەبارێنیو لە گوناحەکانی خۆش نەبێت، ئەگەر بگری بەڵام فرمێسك لە چاوی نەیەت ئەوا زیان دەبینێت.ئەگەر بگری لەجێی فرمێسك خوێن لەچاوی بێتە خوار ئەوا لەکارە ڕابردوەکانی پەشیمان دەبێتەوە.

گوریس چنین : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ گوریس بچنێ بۆ سەفەر دەڕوات وە ماوەی سەفەرەکەی بەندە بە درێژی یان کورتی گوریسەکە.

گڵ : ئەگەر کەسێ لەخەویدا گڵ بخوات بەڵگەی ئەوەیە پارە بۆ ژنەکەی خەرج دەکات، ئەگەر ببینێ ماڵەکەی بە گڵ بکاتەوەو سیواقی بدات ئەوا دوچاری خەمو پەژارە دەبێت، ئەگەر ببینێ سەوز یان سوربێت، ئەوا سەرگەرمی گاڵتەو گەپ دەبێت، بینینی گڵی ڕەش لەخەودا خەمو پەژارەیە، ئەگەر نوقم بێت لەگڵدا ئەوا کۆستی دەکەوێتو دوچاری بەڵا دەبێت.

گوڵ : لێکدانەوەی گوڵ لەخەودا دو لایەنی هەیە یەکێکیان ئەوەی گوڵەکە بە لقو درەختەکەوە بێت ئەوی تریان کرابێتەوە لە درەختەکەی لێکدانەوەی گوڵێك دەوامی نەبێت واتە تەمەنی کەم بێت بەڵگەی خەمو پەژارەیە، ئەگەر گوڵ ببینێ کە لەوەرزی گوڵدا نەبێت ئەوا بەهۆی منداڵەکەیەوە دوچاری خەمو پەژارە دەبێت وە ئەگەر گوڵێ ببینێ کرابێتەوە لە درەختەکەی ئەوا دیسانەوە دوچاری غەمو پەژارە دەبێت.

## جۆرەکانی گوڵ

**گوڵی هەنار** : لێکدانەوەی گوڵی هەنار لەخەودا بەڵگەی زەماوەندو قازانجە، ئەگەر ببینێ گوڵی هەنار لە درەختەکەی بێتەوە ئەوا لە بوکەکەی یان کەنیزەکەکەی جیا دەبێتەوە.

**گوڵی وەنەوشە** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا گوڵی وەنەوشە ببینێ لە وەرزی خۆی دابێت ئەوا لە ژنێکەوە یان کەنیزەکێکەوە شتێکی دەست دەکەوێت یان منداڵی دەبێت. ئەگەر گوڵ وەنەوشەی بەلێکراوەیی ببینێ ئەوا دوچاری غەمو پەژارە دەبێت.

**گوڵی تاج کەڵەشێر** : لێکدانەوەی گوڵی تاج کەڵەشێر لەخەودا شادیو خۆشحاڵییە بەڵام بۆ دینی بینەری خەوەکە باش نییە، ئەگەر لەخەودا گوڵی تاجە کەڵەشێری هەبێت یان کەسێ پێی بدات ئەوا شادیو کامەرانی دەبینێ، وە ئەگەر ئەو گوڵەی دا بەکەسێك ئەوا ئەو کەسە خۆشحاڵ دەکات.

**گوڵە هێرۆ** : لێکدانەوەی گوڵە هێرۆ لەخەودا سودو قازانجی کەمە، ئەگەر گوڵە هێرۆ ببینێ وە لەوەرزی خۆیدا نەبێت ئەوا دوچاری خەم دەبێتو خواردنی ئەو گوڵە لەخەودا بەڵگەی ئافاتو زیانو زەرەرە، ئەگەر لەخەویدا سەری پێ بشوات ئەوا تۆبە دەکاتو پارسایی دەکاتە پیشەی خۆی.

**گوڵە سونبلی** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا گوڵە سونبلی تازەو گەشی هەبێت ئەوا بەو ئەندازەیە سەروەتو سامانی دەست دەکەوێت، ئەگەر ببینێ گوڵە سونبلی سیسو ژاکاوی هەبێت ئەوا لێکدانەوەی پێچەوانە دەبێتەوە.

**گوڵە سەوسەن :** ئەگەر كەسێ لەخەویدا گوڵە سەوسەنی بینی بەڵام لەوەرزی خۆیدابێت ئەوا منداڵی دەبێت یان شتێكی دەست دەكەوێت، ئەگەر گوڵە سوسەن بە وەریوی ببینێ ئەوا دوچاری غەم‌و پەژارە دەبێت، ئەگەر ژنەكەی گوڵە سەوسەن لێ بكاتەوەو پێی بدات بەڵگەی ئەوەیە ژنەكەی تەڵاق دەدات وە ئەگەر گوڵە سەوسەن بدات بە نۆكەرەكەی ئەوا نۆكەرەكەی لە دەستی ڕادەكات.

**گوڵە شەوبۆ :** لێكدانەوەی گوڵە شەوبۆ لەخەودا بەڵگەی غەم‌و پەژارەو نەخۆشییە.

**گوڵە لادن :** ئەگەر كەسێ لەخەویدا گوڵە لادانی هەبێت بەڵگەی ئەوەیە دەبێتە كەسێكی پایە بەرزو ناودار.

**گوڵە لالە :** ئەگەر كەسێ گوڵە لالەی لەوەرزی خۆیدا بینی بەڵگەی ئەوەیە منداڵی دەبێت، ئەگەر لە وەرزی خۆیدا نەبێت بەڵام بە لاسكەكەی خۆیەوە بێت ئەوا هەواڵێكی پێ دەگات وە ئەگەر بەوەریوی ببینێ ئەوا دوچاری پەژارە دەبێت، ئەگەر ژنەكەی ببینێ گوڵە لالە لە لقەكەی بكاتەوەو پێی بدات بەڵگەی ئەوەیە ژنەكەی تەڵاق دەدات هەروەها ئەگەر پیاو ئەو كارە بكات لێكدانەوەكەی هەروەها دەبێت.

**گوڵە نێرگس :** دانیال (ع) دەڵێ : نێرگس لەخەودا پیاوی بەشەوق‌و زەوقە، ئەگەر ژن لەخەودا ببینێ گوڵە نێرگسی تەڕو تازەی هەبێت ئەوا كچێكی جوانی دەبێت وە ئەگەر مێردی نەبێت ئەوا شو دەكات، ئەگەر كەسێ لەخەودا گوڵە نێرگس هەڵبكەنێت ئەوا ژنەكەی تەڵاق دەدات.

**گوڵە نەسرین :** لێکدانەوەی گوڵی نەسرین لەخەودا کامەرانیو خۆشحاڵییە. هەندێکیش دەڵێن بەڵگەی منداڵە، ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ کەسێك چەپکێك گوڵی نەسرینی پێ بدات ئەوا لە گەڵیدا گفتوگۆو چاوپێکەوتن دەکات.

**گوڵی یاسمین :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا گوڵی یاسمین ببینێ بەو مەرجەی لە وەرزی خۆیدا بێت بەڵگەی ئەوەیە منداڵێکی کامەرانو خۆش بەختی دەبێت بەڵام لێکردنەوەی گوڵی یاسمین لە لقەکەی بەڵگەی خەمو پەژارەیە. ئەگەر کەسێ گوڵی یاسمینی لەخەودا پێ بدات بەڵگەی ئەوەیە لێك جیا دەبنەوە. تۆپەڵە گوڵی یاسمین لەخەودا بەڵگەی ژنێکی کردار ناپەسەندو دەوڵەمەندە، ئەگەر گوڵی یاسمین سپی بێت ئەوا لێکدانەوەکەی ژنێکی ڕەوشت بەرزە.

**گوڵی زمانەگا :** لێکدانەوەی گوڵی زمانەگا لەخەودا شەڕو ناکۆکیو کێشمەکێشە.

**گوڵاو :** خواردنەوەی گوڵاو لەخەودا بەڵگەی دینی ڕاستو ماڵی حەلاڵە، ئەگەر لەخەودا یەکێك گوڵاوی پێ بداتو لێی بخواتەوە ئەوا بەو ئەندازەیە سەروەت بەدەست دێنێ، ئەگەر گوڵاوی پێ بدرێت بەڵام لێی نەخواتەوە لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

**گوارە :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا گوارە بەهەردو گوێیەوە بێت بەڵگەی ئەوەیە لەبەر خەڵکی ناڕایشت دەکات. ئەگەر هەردو گوێی گوارەی مرواری پێوەبێت بەڵگەی ئەوەیە زانستی قورئانی فێر دەبێتو دەبێت بەزانا.

گون : ئەگەر کەسێ لەخەویدا بینی گونی گەورەبو، سەروەتو دارایی زیاد دەکات وە ئەگەر ببینێ گونی بېردرێ دوژمن بەسەریدا زاڵ دەبێت، وە ئەگەر لەخەویدا گونی بچوك بێتەوە هێزو دارایی ئەو کەسە کەم دەبێتەوە، وە ئەگەر ببینێ گونی چەپی دەرهێناو دور فڕێی دا نەخۆش دەکەوێت وە ئەگەر بینی گونی بە حەزو ئارەزووی خۆی بەخشی بە کەسێك واتاکەی ئەوەیە کە منداڵێکی زۆڵی هەیە کە لە نەسلی کەسێکی ترە. وە ئەگەر بینی گونی وەرهەمی کردبێ وەیان توشی فتق بوبێ واتای ئەو خەوە ئەوەیە کە سەروەتو سامانی زۆر بەدەست دێنێت بەڵام بە دەست دوژمنانەوە لە دژواری دایە وە ئەگەر ببینێ گونی درێژبێتەوە بە شێوەیەك کە بەزەویدا بخشێ واتای ئەوەیە سەروەتێکی زۆری بۆ کۆ دەبێتەوە، وە ئەگەر ببینێ لەگەڵ کەسێکدا گونیان ئاڵوگۆڕکرد واتای ئەوەیە کە هەردوکیان پێکەوە خیانەت لە ژنی یەکتری دەکەن، وە ئەگەر ببینێ پێستی گونی لێ بکاتەوە، کەسێ زوڵم لە منداڵەکەی ئەو دەکات وە ئەگەر ببینێ کەسێك گونی بگوشێو لە هۆش بکەوێت ئەوا هەواڵی مردنی منداڵێکی پێ دەگات وە ئەگەر منداڵیشی نەبو ئەوا پلەو پایەی کەم دەبێتەوە، ئەگەر ببینێ گونی بە حەبل یان تەنافەوە بەسترابێ مانای ئەوەیە کارو کردارەکانی پەشێو دەبێ وە ئەگەر گونی خەڵکی بەو شێوە ببینێ بەرگری لە خراپەی دوژمنانی دەکات، وە ئەگەر ببینێ گونی کەمو کوڕی لێ پەیدا ببێت دوژمن بەسەریدا زاڵ دەبێتو دوچاری غەمو پەژارە دەبێتەوە وە ئەگەر ببینێ ژێر گونی ئەویان بڕی هێزو بازووی کەم دەبێتەوە.

**گورگ :** ئەگەر ببینێ گورگ بیگەزێ ژنەکەی تەڵاق دەدات وە ئەگەر ببینێ گورگ بکوژێتو گۆشتەکەی بخوات بەو ئەندازەیە ئیرسی پێ دەگات.

**گورز :** لێکدانەوەی گورز لەخەودا پیاوێکی چاکو باوەڕدارو ڕاستگۆیە.

**گورچیلە :** لێکدانەوەی گورچیلە لەخەودا سەروەتی شاراوەیە کە پەیدای دەکاتو خەرجی دەکات، ئەگەر ببینێ گورچیلەی برژاوی هەبێت ئەوا ئەو سەروەتەی کە شاردویەتییەوە دوبارە دەری دەهێنێتەوە.

**گوێز :** لێکدانەوەی گوێز لەخەودا سەروەتێکە بە ناڕەحەتی بەدەستی دێنێت، ئەگەر یاری بە گوێز بکات ئەوا لەگەڵ کەسێکدا شەڕو دوژمنایەتی دەکات.

**گۆگرد :** لێکدانەوەی گۆگرد لەخەودا غەمو پەژارەیە.

**گۆزە :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا گۆزەی گڵی هەبێت ئەوا کەنیزەکێك دەکڕێت، ئەگەر گۆزەکە مسی سپی بێت ئەوا بەڵگەی خزمەتکارو نۆکەرە، ئەگەر لەگۆزەدا ئاو بخواتەوە ئەوا لەگەڵ کەنیزەکێکدا جوت دەبێت.

**گڵۆپە سەقف (قەندیل) :** ئەگەر کەسێ لەخەویدا گڵۆپێکی سەقفی ڕوناکی بینی بەڵگەی ئەوەیە سەرکەوتو دەبێت لە پەرستنی خوادا، ئەگەر ببینێ لە ماڵەکەیدا یان دوکانەکەیدا گڵۆپی سەقف هەڵواسرابێت یان داگیرسابێت ئەوا لەگەڵ ژنێکی باشدا هاوسەرگیری

دەكات وە ئەگەر ئەم خەونە ژنێك ببینێ بەڵگەی ئەوەیە زۆر سەرگەرمی بەندایەتی كردنی خوا دەبێت.

**گوناح :** ئەگەر كەسێ لەخەویدا دوچاری گوناح یان تاوان بوبێت بەڵام نەزانی گوناحەكەی چییە بەڵگەی ئەوەیە دوچاری بەڵاو موسیبەت دەبێت.

**گومەزی :** لێكدانەوەی گومەزی لەخەودا، ژنە، ئەگەر لەخەودا گومەزی تازە ببینێ بەڵگەی ئەوەیە لەگەڵ ژنێكی جواندا هاوسەرگیری دەكات.

**گوێچكە :** ئەگەر كەسێ لەخەویدا گوێی بكەوێتە خوارەوە بەڵگەی ئەوەیە ژنەكەی تەڵاق دەدات هەندێكیش دەڵێن كچەكەی دەمرێت یان مەرگی خۆی نزیك بۆتەوە، ئەگەر لەخەودا كەڕ ببێ بەڵگەی ئەوەیە دینی ناتەواوە.

**گوێرەكە :** ئەگەر كەسێ لەخەویدا گوێرەكە نێرێكی هەبوو ئەوا كوڕێكی دەبێت وە ئەگەر گوێرەكەیەكی مێیەی هەبوو ئەوا كچێكی دەبێت.

**گۆچان :** ئەگەر لەخەودا ببینێ گۆچانی بەدەستەوەبێتو پێی بڕوا، ئەوەی كە بە شوێنیەوەیە بە دەستی دێنێ وە بینەری خەوەكە پلەو پایەی بەرز دەبێتەوە بەڵام لە كاروباری ئاینیو خواپەرستی دا سستو تەمەڵ دەبێ.

**گۆرەوی :** لێكدانەوەی گۆرەوی لەخەودا ژنی خزمەتكارە، ئەگەر ببینێ گۆرەوی تازەی ئاوریشمی یان دەزویی لەپێكردبێ خزمەتكارێكی چاكی ئەبێ وە بەهرەشی لێ دەبات، ئەگەر ببینێ

گۆرەوی خوری یان گوڵ گوڵی هەبێ کەنیزەکێکی جوان دەکڕێ یان لەگەڵ ژنێکی جواندا هاوسەرگیری دەکات، ئەگەر ببینێ گۆرەوی زەردی هەبێ ئەوا خزمەتکارێکی نەخۆش پەیدا دەکات، ئەگەر ببینێ گۆرەوییەکەی سورە خزمەتکارێکی شۆخو بێ شەرمی هەیە، ئەگەر ببینێ گۆرەوییەکەی ڕەش بێو بینەری خەوەکە کەسێکی باش بێت لێکدانەوەکەی چاك دەبێت وە ئەگەر بینەری خەوەکە کەسێکی خراپ بێ لێکدانەوەکەی خراپ دەبێت، ئەگەر ببینێ گۆرەوییەکەی دڕاوو کۆنەبێت خزمەتکارەکەی بە فاسد تاوانبار دەکات وە ئەگەر ببینێ گۆرەوییەکەی وون ببێت یان بسوتێ خزمەتکارەکەی دەمرێت.

**گوێچکە ماسی(سەدەف)** : ئەگەر ببینێ گوێچکە ماسی هەبێت ئەوا خزمەت کارێك پەیدا دەکات، ئەگەر گوێچکە ماسی وون کرد ئەوا خزمەت کارەکەی هەڵدێت.

**گۆشت** : لێکدانەوەی گۆشت لەخەودا سەروەتو سامانە، هەرچی گۆشتەکە پاکتربێت سەروەتو سامانەکە ئاسانتر بەدەست دێت، ئەگەر لەخەودا گۆشتی کاڵ بخوات بەڵگەی ئەوەیە سەروەت بە ناڕەحەتی بەدەست دێنێ، کڕینو فرۆشتنی گۆشت لەخەودا خراپە.

**گۆشتی کوڵاو** : لێکدانەوەی گۆشتی کوڵاو یان برژاو لەخەودا چاکترە لەگۆشتی کاڵ. ئەگەر گۆشتی برژاوی مەڕبخوات بەڵگەی ئەوەیە بەو ئەندازەیە بە زەحمەتو ناسۆرەوە سەروەتو ماڵ بەدەست دێنێ، ئەگەر گۆشتی برژاوی گا یان ئەسپ بخوات بەڵگەی ئەوەیە لەلایەن پادشاوە سودو قازانجی پێ دەگات.

**گۆشتی ووشك كراو** : ئەگەر كەسێ لەخەویدا گۆشتی ووشك كراوی مەڕی هەبێت بەڵگەی ئەوەیە سەروەتو سامان بەدەست دێنێ، ئەگەر گۆشتی ووشكی ئەسپی هەبێت بەڵگەی ئەوەیە خەڵكی غەیبەتی دەكەن بە گشتی خواردنی گۆشتی ووشك لەخەودا هیچ سودێكی نییە.

**گۆڕ** : ئەگەر كەسێ لەخەویدا بیخەنە ناو گۆڕەوە بەڵگەی ئەوەیە زیندانی دەكرێت، ئەگەر بەسەر بانەكەیەوە گۆڕ هەڵبكەنن بەڵگەی ئەوەیە تەمەنی درێژ دەبێت.

**گۆڕستان** : لێكدانەوەی گۆڕستان لەخەودا، چاوپێكەوتنو دانیشتنە لەگەڵ كەسانی سەر لێشێواو نەفامدا.

**گۆڕینی ناو** : ئەگەر كەسێ لەخەویدا ببینێ ناوی خۆی بگۆڕێت، ناوەكانی (أحمد، محمد، سعید، یان صالح)ی بۆ خۆی هەڵبژارد ئەوا لێكدانەوەی چاكە وەئەگەر ناوێكی خراپتر لە ناوەكەی خۆی بێت بەڵگەی گوناحو تاوانە.

**گۆزەی دەسكدار** : لێكدانەوەی گۆزە لەخەودا، نۆكەرێكی دوو ڕوو ڕیاكارە كە بەدەستی ئەو سەروەتو سامانی بەفیرۆ دەچێت.

**گیا** : گیای تەڕو تازە لەخەودا بەڵگەی بژێوی زۆرو دینداری بینەری خەوەكەیە، ئەگەر ببینێ لە شوێنێكی سەر سەوزدا دانیشتبێت، بەڵگەی ئەوەیە لەدیندا كەسێكی جێگیرو ڕاوەستاوە، ئەگەر ببینێ گیا لە لەشی ڕوابێت بەڵگەی ئەوەیە ڕزقی زۆر دەبێت، ئەگەر ببینێ گیا لە دەشتو بیابانەوە بۆماڵەوە بهێنێتەوە بەڵگەی ئەوەیە لەسەفەردا سەروەتو سامان بەدەست دێنێ، ئەگەر ببینێ

سەوزیو گیا لە ماڵەکەیدا فڕێ بدات بەڵگەی ئەوەیە سەروەتو سامانی خۆی لەڕێگای خێردا خەرج دەکات، ئەگەر ببینێ گیا بخوات ئەوا نەخۆش دەکەوێت.

گیان (رۆح) : لێکدانەوەی رۆح لەخەودا منداڵ یان ژنێکی سازگار یان سەروەتو سامانە، ئەگەر ببینێ گیانی دەربچێ منداڵ یان ژنەکەی دەمرێ وەیان سەروەتو سامانی تیا دەچێ وەیان خۆی دەمرێت، وە ئەگەر رۆحی خۆی بە شێوەی پیاوێکی چاکو جوان ببینێ دەبێتە خاوەن منداڵێکی چاکو جوانو حاڵو گوزەرانی باش دەبێت وەیان بە خزمەتی پاشایەکی رێکو پێك دەگات وە ئەگەر رۆحی خۆی بە شێوەیەکی ناشیرین ببینێ لێکدانەوەکەی پێچەوانەیە.

گرجی (زمانی گرجستان) : بە چاوپێکەوتنی کەسی نەزانو بەدڕەوشتدا دوچاری غەمو پەژارە دەبێ هەروەها ئەگەر ببینێ بە زمانێکی نەناسراو کە هەرگیز نەی بیستبێ قسە بکات ئەوا لە کارێکدا سەرسام دەبێتو تیا ئەمێنێ وە نازانێ بە چ جۆرێك لێی دەرباز ببێت.

لاذێ (بۆ لادێ ڕۆیشتن) : ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ کە لە لادێیەکدایەو ناوەکەی نەزانێ ئەوا بەڵگەی خێرو چاکەیە وە ئەگەر ناوی لادێکەی زانی بەڵگەی خراپییە وە ئەگەر ببینێ لە لادێکە هاتە دەرەوە چاکەیە وە ئەگەر بۆ لادێکە بڕوات خراپەیە.

لاوازی : ئەگەر لەخەودا ببینێ سەری لاوازبێ ئەوا لە پلەوپایەی دوور دەخرێتەوە، ئەگەر ببینێ چاوی لاوازبێت ئەوا کچەکەی یان ژنەکەی دەمرێت. ئەگەر ببینێ لوتی لاوازبێ پلەوپایەی کەم دەبێتەوە. ئەگەر هزری خۆی لاوازبێ ئەوا تەنگ دەستو هەژار دەبێت، ئەگەر ببینێ گەردنی لاوازبێ ئەوا ئەمانەتی خەڵکی پێ دەسپێردرێت، ئەگەر شانی لاوازبێ ئەوا ژنەکەی نەخۆش دەکەوێت، ئەگەر بازووی خۆی بە لاوازی ببینێ ئەوا ئەحواڵی براکەی یان کوڕەکەی خراپ دەبێت. ئەگەر ببینێ مەچەکی لاوازبێ ئەوا کچەکەی دوچاری بێ هێزی دەبێت. ئەگەر سینەی خۆی بە لاوازی ببینێ ئەوا دەست لە بەخشندەیی هەڵدەگرێت، ئەگەر سکی لاوازبێ ئەوا پشتو پەناگەی کەسێکی بێ توانا دەبێت، ئەگەر دڵی لاوازبێ ئەوا ئەقڵو بیرو هۆشی لەدەست دەدات، ئەگەر هەموو لەشی بە لاوازی ببینێ ئەوا غەمگینو پەژارە دەبێت.

لافاو : لێکدانەوەی لافاو لەخەودا دوژمنێکی گەورە یان پاشایەکی ستەمکارە. ئەگەر لەخەودا ببینێ ڕووبەڕووی لافاو بێتەوە لەگەڵ دوژمنێکدا شەڕ دەکات. ئەگەر ببینێ لە لافاو بێتە دەرەوە

ئەوا بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێت، ئەگەر ببینێ لە شوێنێکدا کە کوێستان و ساردبێت لافاو هەڵسێت بەڵگەی خەم و بەزارمیە وە ئەگەر لە شوێنێکی گەرمەسێردابێت لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت. ئەگەر ببینێ لافاو چووە ناو ماڵێك یان گوڵاڵێکەوە بەڵگەی بەردو پێش چوونی بەتی لەکارەکانی دا.

لاق (نێوان ئەژنۆو پاژنە) (ساق) : لێکدانەوەی لاق لەخەودا بەسەروەت و بەزێوی خەڵکە و ژیانیان بەلاقەوە بەندە چونکە خەڵکی لەسەر لاق ڕادەوەستن. ئەگەر ببینێ لاقی سالم و بەهێزبێ ئەوا وەزع و ژیانی باش دەبێت وە ئەگەر لاقی بە لاوازو شکاوی ببینێ ئەوا ژیانی لاواز دەبێت.

لاڵ : ئەگەر کەسێ لەخەویدا لاڵ بێ بەڵگەی ئەوەیە دین و ئاینی ئەو کەسە کەم و کورتی هەیە.

لانە (هێلانە) : ئەگەر کەسێ ببینێ لە ماڵەکەیدا هێلانەی باڵندەیەك هەبێت بەڵگەی ئەوەیە بە ئەندازەی نرخی ئەو باڵندەیە سودو قازانج دەبینێ، ئەگەر هێلانە خراپ بکات بەڵگەی ئەوەیە کارێکی ناپەسەندو خراپ ئەنجام دەدات، ئەگەر هێلانە هەڵبگرێ و لەجێی خۆی دایبنێتەوە بەڵگەی ئەوەیە یارمەتی کەسێك دەدات، ئەگەر مریشکێکی گەورە لە هێلانەدا ببینێ بەڵگەی ئەوەیە کەسێکی گەورە پەنای دەدات و سودو قازانجی پێ دەگەیەنێت.

لارو لەوێری ڕوخسار : ئەگەر کەسێ لەخەویدا بەهۆی نەخۆشییەوە ڕوخساری لارو لەوێر بوبێت بەڵگەی ئەوەیە لەنێو خەڵکیدا شان کزو زەلیل دەبێت.

لاوازی : ئەگەر کەسێ لەخەویدا لاوازبێ بەلگەی ئەوەیە لەسەروەتی کەم دەبێتەوە، ئەگەر لاوازبێو ڕەنگو ڕوخساریشی زەرد بوبێت بەلگەی ئەوەیە دوچاری نەخۆشیو خەمو پەژارە دەبێت.

لەپی دەست : ئەگەر کەسێ لەخەویدا لەپی دەستی لێك بخشێنێت بەلگەی ئەوەیە لە هاوڕێو خزمەکانی خۆی جیا دەبێتەوە هەندێکیش دەڵێن لەو گەڕەکەدا زەماوەند دەکرێت، ئەگەر ببینێ لەپی دەستەکانی برینداربێت ئەوا لەسەفەردا تیا دەمێنێت، ئەگەر لەپی دەستەکانی خۆی بەهێزو توانا ببینێ ئەوا دەوڵەمەند دەبێت وە ئەگەر پێچەوانەکەی ببینێ هەژارو تەنگ دەست دەبێت.

لەش : ئەگەر کەسێ ببینێ لەخەویدا ئەندامەکانی لەشی زیادی کردووە، خێزانو خزمەکانی ئەو کەسە زیاد دەکەن، وە ئەگەر ببینێ ئەندامەکانی ئەو ببڕدرێتەوە یان لە لەشی جیابێتەوە بۆ سەفەر دەڕواتو خزمەکانی ئەو کەسە پەرتەوازە دەبن، ئەگەر ببینێ ئەندامی لەشی خۆی دەبڕێت، خێزانو خزمەکانی خۆی لە شارەکاندا پەرتەوازە دەکات.

لەغاوی ئەسپ : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ لەغاوی ئەسپەکەی بپچڕێت ئەوا لە پلەو پایەی کەم دەبێتەوە. ئەگەر ببینێ وەکو ئەسپ هەوسارکرابێت ئەوە ڕۆژو دەگرێت بەلاّم قسەی زۆر ناشیرینو خراپ دەکات.

لە کار دەرکردن : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ کە پیرە پیاوێکی کەم ناو و نامۆ لە کارەکەی دەربکرێت بەلگەی ئەوەیە کە ئەو پیرە پیاوە گەنج دەبێتەوە بەلاّم ئەگەر ئەو پیرە پیاوە ناسراو و

بەناوبانگ بێت لێکدانەوەی ئەوەیە ئەنگیو کەمو کورتی دەبینێ. ئەگەر ئەم خەوە گەنجێ ببینێ لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت، ئەگەر ببینێ کەسێکی گەورە لە سەرکار دەریکەن بەلگەی ئەوەیە دینی لاوازەو پێویستە تۆبە بکات و بگەڕێتەوە.

لە پێشەوە بوون : ئەگەر لەخەودا ببینێ کە لە کارێکدا پێشی کەسێکی دایەوە وەکو کارەکانی دین، حەجو بەندایەتیو لەو بابەتانە لە ڕۆژی کۆتاییدا سەربەرز دەبێت و خودا پاداشتی دەداتەوە، وە ئەگەر لە کارەکانی ڕۆژانەدا پێشی کەسێکی دایەوە سەروەتو سامانو کامەرانی دەست دەکەوێت.

لەگەردن دان (لەملدان) : ئەگەر کەسێ لەخەویدا لە ملی بدرێتو سەری لە لەشی ببێتەوە ئەگەر بەندە یان نۆکەربێت ئەوا ئازاد دەبێت، ئەگەر نەخۆش بێت چاك دەبێتەوە، ئەگەر قەرزار بێت قەرزەکانی دەداتەوەو حەج دەکات، ئەگەر کافر بێت موسڵمان دەبێت، ئەگەر سەری لە لەشی نەبێتەوە ئەوا لێکدانەوەکانی سەرەوە لە لێدەرەکەوە دەگات بەئەو بە گشتی لە گەردندان لەخەودا بۆ هەژار چاکەو بۆ دەوڵەمەند خراپە.

لەرزە (لەرینەوە) : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ ئاسمان بلەرێتەوە بەلگەی ئەوەیە لەو شوێنەدا زوڵمو ستەم فەرمانڕەوایە، ئەگەر ببینێ مانگ یان خۆر بلەرێتەوە بەلگەی ئەوەیە حاکم یان پاشای ئەو شوێنە دوچاری زیان دەبێتەوە.

لەرزین : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ سەری بلەرزێت بەلگەی ئەوەیە دوچاری ئازارو ئەشکەنجە دەبێت، ئەگەر ملی بلەرزێت

بەڵگەی ئەومیە ئەمانەت داری ناکات، ئەگەر دەستەکانی بلەرزێت بەڵگەی ئەومیە قسەی ناخۆش‌و تاڵ دەبیسێ، ئەگەر سکی بلەرزێت ئەوا لەسەفەردا دوچاری زەحمەت دەبێت.

لەشکر : ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ لەشکرێك ئازاری خەڵکی شوێنێك بدات مانای ئەومیە خەڵکی ئەو شوێنە بەهێزو توانا دەبن.

لەقە : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ لەقە لەکەسێك بدات بەڵگەی ئەومیە ومزع‌و ڕۆژگاری خراپ دەبێت، ئەگەر ببینێ ئەسپ یان هێستر لەقەی لێ بدات بەڵگەی ئەومیە کارەکانی خراپ دەبێت، ئەگەر حوشتر لەقەی لێ بدات بەڵگەی ئەومیە لە سەفەرکردندا ڕەنج‌و ئازاری پێ دەگات، ئەگەر گا لەقەی لێ بدات بەڵگەی ئەومیە زیان دەبینێ.

لەعلی (لەبەردە بە نرخەکان وەکو یاقوت‌و مەرجان) : لێکدانەوەی بینینی لەعلی لەخەودا، ژنی ناسك‌و جوانە، ئەگەر لەخەودا لەعلی خستە ناو ئاگرەوە بەڵگەی ئەومیە لەگەڵ ژنێکی ناوداردا هاوسەرگیری دەکات وە یان کەنیزەکێکی جوان دەکڕێت وە هەندێکیش دەڵێن کچێکی دەبێت.

لێو : لێکدانەوەی لێو لەخەودا بەدی هاتنی ئارەزوەکانە، بینینی لێوی خوارەوە چاکترە لە لێوی سەرەوە، هەندێك دەڵێن بینینی لێو لەخەودا بەڵگەی خزمایەتییە، ئەگەر ببینێ لێوەکان هی خۆی نەبن بەڵگەی ئەومیە لەسەروەتی کەم دەبێتەوەو لەوانەشە ژنەکەی بمرێت، ئەگەر ببینێ لێوی ببڕن بەڵگەی ئەومیە ژنەکەی تەڵاق دەدات.

لوت : ئەگەر کەسێك لەخەویدا ببینێ کە مێشکی لە لوتییەوە بێتە دەر لە کەسێکی گەورەو ناودارەوە قازانجێکی پێ دەگات. وە ئەگەر

ببینێ گیانلەبەرێك وەكو مێشو كرم لە لوتییەوە بێتە دەر منداڵێكی دەبێت وە ئەگەر بینی لوتی كون كراوەو ئەڵقەو لوتەوانەی پێوەكرابێ لەگەڵ خەڵكیدا بە ڕێزو ئیحترامەوە ڕەفتار دەكات وەیان لەگەڵ ژنێكی گەورەو ناوداردا دەبێتە هاوسەر وە لەو ژنەشەوە ماڵو سەروەتی پێ دەگات، وە ئەگەر ببینێ لوتی گیراوە بە شێوەیەك كە نەتوانێ هەناسە بدات كارەكانی بەبن بەست دەگات وە ئەگەر ببینێ لوتی ڕوشابێت سەروەتو سامانی لەدەست دەچێتو كامەرانی لەدەست دەدات.

لیمۆ : لێكدانەوەی بینینی لیمۆ لەخەودا نەخۆشیە، بەگشتی لیمۆ لەخەودا هیچ سودێكی نیە.

لۆبیا : لێكدانەوەی بینینی لۆبیا لەخەودا چ لە وەرزی خۆی دابێت یان لە هەر وەرزێكی تردا بێت چ كاڵ بێت یان لێنراوبێت بەڵگەی غەمو پەژارەیە.

لقی درەخت : لقی درەخت لەخەودا براو منداڵو خزمانە. ئەگەر ببینێ درەختەكەی لقی زۆری هەبێ ئەوا نزیكەكانی واتە خزمەكانی زیاد دەكەن، ئەگەر لقەكانی كەم بوو لێكدانەوەی پێچەوانە دەبێت. ئەگەر ببینێ لقێك لە درەختەكەی خۆی ببڕێ ئەوا یەكێك لە نزیكەكانی دەر دەكات. ئەگەر ببینێ لقێك لە درەختەكەی كەم بویەوە ئەوا یەكێ لە منداڵەكانی یان نزیكەكانی دەمرێت. ئەگەر ببینێ لقێك درەختی خورمای بەدەستەوە بێت ئەوا دەبێتە خاوەن منداڵ.

## پیتی ( م )

ماچ : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ کە کەسێکی ماچکرد دەبێتە هاوڕێی ئەو کەسە، وە ئەگەر ئەو کەسە نەناسراوبوو لە جێگەیەکەوە کە بە بیرو هۆشیدا نەهاتبێ خێرو بەرەکەتی پێ دەکات وە ئەگەر ببینێ کەسێکی ناسراو ماچی بکات لەو کەسەوە خێرو بەرەکەتی پێ دەگات.

مار : مار لەخەودا دوژمنێکی پەنهانە، ئەگەر مار لە ماڵەکەیدا ببینێ بەڵگەی دوژمنی خێزانییە وە ئەگەر مار لە بیاباندا ببینێ بێگانەیە، ئەگەر ببینێ لەگەڵ ماردا شەڕ بکات لەگەڵ دوژمندا شەڕ دەکات، ئەگەر مار زاڵ بوو بەسەریدا دوژمن بەسەریدا زاڵ دەبێت وە ئەگەر ئەو زاڵ بوو بەسەر مارەکەدا ئەوا بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێت. ئەگەر ببینێ گۆشتی مار بخوات، بە پاشایەتی دەگات، ئەگەر ببینێ مار دوکەرت بکات سەروەتی دوژمن دەخوات وە ئەگەر ماری مردو ببینێ لە بەلآیەکدا پارێزراو دەبێ.

ماست : لێکدانەوەی بینینی ماستی خۆش‌و شیرین سودو قازانجە وە ماستی ترش غەم‌و پەژارەیە.

ماسی : ئەگەر ببینێ کەسێ ماسیەکی سوێر یان ووشکی پێ بدات ئەوا زوڵم‌و ستەم دەکات، ئەگەر ماسی بچوکی بینی لە نۆکەرەکەیەوە زیانی پێ دەگات هەندێکیش دەڵێن بۆ سەفەر دەڕوات.

**ماسی گره** : بینینی ماسی گره لەخەودا زیادبونی ڕزق‌و ڕۆزییەو سەروەتێکە کە لە ژنەوە دەگات بەدەستی بینەری خەوەکە، ئەگەر ببینێ ماسیگرەی گرت وەیان کەسێ پێی بدات بە ئەندازەی ئەوە ماڵ‌و سەروەت لە لایەن ژنەوە بەدەستی دەگات. ئەگەر ماسیگرەی کوشت‌و گۆشتەکەی خوارد بە ئەندازەی ئەو گۆشتە لەماڵی ژن دەخوات.

**ماسی خۆر** : مری ماسی خۆر لەخەودا بەڵگەی ژنە، ئەگەر ببینێ مری ماسی خۆری هەبێ ژن دەهێنێ وە ئەگەر ببینێ مری ماسی خۆر لەدەستی بەربێ ژنەکەی تەڵاق دەدات.

**ماش** : ئەگەر لەخەودا ببینێ ماشی کوڵاو بخوات بەڵگەی ئەوەیە سامانێکی کەم بەدەست دێنێ وە ئەگەر ماشی کاڵ بخوات بەڵگەی ئەوەیە دوچاری غەم‌و پەژارە دەبێت.

**مامۆستایی** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا مۆستایی بکات بەڵگەی ئەوەیە بە پلەو پایە دەگات. ئەگەر ببینێ وانە بە منداڵان بڵێتەوە بەڵگەی ئەوەیە لەو شوێنەدا قسەکانی کاریگەر دەبێت‌و خەڵکی گوێڕایەڵی دەکەن.

**مانگ** : لێکدانەوەی مانگ لەخەودا پاشایە، ئەگەر ببینێ مانگ ببێت بە نیوە بەڵگەی ئەوەیە پاشاکەی یان وەزیرەکەی دەمرێت، ئەگەر ببینێ لەگەڵ مانگدا قسە بکات بەڵگەی ئەوەیە دەبێت بە فەرمانڕەوای شوێنێك، ئەگەر ببینێ دو مانگ لەگەڵ یەکتردا شەڕ بکەن بەڵگەی ئەوەیە لەنێوان دو پاشادا شەڕو ناکۆکی بەرپا دەبێت

وە ئەگەر ببینێ یەکێ لەو دو مانگە کەرت ببێت بەڵگەی ئەوەیە یەکێ لەو دو پاشایە لەسەر تەخت دەردەکرێت.

مەشکە ئاو : لێکدانەوەی مەشکە ئاو لەخەودا، سەفەرکردنە، ئەگەر ببینێ مەشکەی تازەی هەبێت بەڵگەی ئەوەیە بۆ سەفەر دەروات‌و سەروەتی زۆر بەدەست دێنێ، ئەگەر مەشکەی کۆنەی هەبێت لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت، ئەگەر ببینێ مەشکەکەی کونی تێدابێت بەڵگەی ئەوەیە لەسەفەردا زەرەرو زیان دەکات.

مەرجان : لێکدانەوەی مەرجان لەخەودا، ژن یان منداڵە، ئەگەر کەسێ لەخەویدا مەرجانی هەبێت بەڵگەی ئەوەیە لەگەڵ ژنێکی منداڵداردا هاوسەرگیری دەکات، ئەگەر مەرجانەکەی وون ببێت بەڵگەی ئەوەیە ژنەکەی تەڵاق دەدات.

مەڕ : مەڕ لەخەودا بەڵگەی دەستکەوتە، ئەگەر ببینێ مەڕ بلەوەڕێنێ ئەوا دەبێتە گەورەو سەرکردەی گروپێك. ئەگەر ببینێ ژمارەیەك مەڕی هەیە وا بزانێ خۆی خاوەنی ئەو مەڕانەیە ئەوا سەروەت‌و سامانی زۆری دەست دەکەوێت. ئەگەر ببینێ گۆشتی سورەوەکراوی مەڕ بخوات بەو ئەندازەیە سەروەت‌و سامانی دەست دەکەوێت. ئەگەر مەڕی کوشت بەسەر دوژمندا زاڵ دەبێ‌و سەروەت‌و سامانەکەی دەخوات.

مەڕە کێوی : بینینی مەڕە کێوی لەخەودا بەڵگەی ژنی میهرەبانە یان پیاوێکی ڕێزدارە. ئەگەر ببینێ مەڕەکێوی هەبێ لەلایەن گەورەیەکەوە سوودی پێ دەگات. ئەگەر ببینێ پێستی

مەرەکێوی لێ بکاتەوە بەسەر کەسێکدا زاڵ دەبێت‌و دەست بەسەر ماڵەکەیدا دەگرێت.

مەعجون : ئەگەر کەسێ لەخەودا بۆ سەرنێشە مەعجون دروست بکات بەڵگەی ئەوەیە لەلایەن خەڵکییەوە سودو قازانجی پێ دەگات، ئەگەر ببینێ مەعجونی ووزە بەخش بخوات بەڵگەی ئەوەیە لەلایەن پاشاوە سودو قازانجی پێ دەگات.

مەستی (سەرخۆشی) : لێکدانەوەی مەستی لەخەودا سەروەتی حەرام‌و تەمەڵی کردنە لە نوێژدا.

مەسح کردن : ئەگەر پیاوێك لەخەویدا ببینێ مەسح بکات بەڵگەی ئەوەیە منداڵی پاك‌و بێ گەردی دەبێت‌و دەبێتە پێشەوای خەڵکی، ئەگەر مەسحی پێڵاوەکانی بکات بەڵگەی ئەوەیە لەسەفەردا سەروەت‌و سامان بەدەست دێنێ‌و کاروبارەکانی بەرەو پێش دەڕوات.

مەلەکردن : لێکدانەوەی مەلەکردن لەخەودا بە دەست هێنانی بژێوییە بە فرت‌و فێڵ کردن، ئەگەر ببینێ لەکاتی مەلەکردن لە ئاوی زوڵاڵ دا ڕۆبچێ ئەوا ئەو پەری پلەو پایەی دنیایی بەدەست دێنێ.

مەمك : بینینی مەمك لەخەودا کچە، ئەگەر کەسێ ببینێ شیر لەمەمکی بێتەخوار رزق‌و ڕۆزی زیاد دەکات‌و ماڵی حەڵاڵ بەدەست دێنێ، وە ئەگەر ببینێ خوێن لە مەمکی هاتە خوار ماڵی حەرام بە دەست دێنێ، وە ئەگەر ببینێ مەمکی لە ڕادە بەدەر شۆڕبێتەوە کچێکی دەبێت، وە ئەگەر ببینێ شیر لە مەمکیدا کۆببێتەوە ئەگەر ژنی نەبێت ژن دەهێنێ‌و منداڵی دەبێت، وە ئەگەر ژنی هەبێ

سەروەتمەند دەبێت وە ئەگەر پیرەژن ئەم خەوە ببینێ هەژار دەکەوێت وە ئەگەر ژنێکی گەنج ئەم خەوە ببینێ تەمەنی درێژ دەبێت وە ئەگەر کچێك ئەم خەوە ببینێ بەزوویی دەمرێت.

**مەمکە بەند (ستیان) :** بینینی مەمکەبەند لەخەودا بۆ ژنان گەیشتن بە پلەو پایەو ڕێزو مەبەستە، وە بۆ پیاوان پرسانەو خەمو پەژارەیە، ئەگەر ژنێك ببینێ مەمکە بەندێکی تازەی هەبێ پلەوپایەو ڕێزی زیاد دەکاتو بە ئارەزووەکانی دەگات، وە ئەگەر پیاوێك ببینێ مەمکە بەندێکی هەبێ وەیان کەسێك پێی بدات خەڵك پشتی تێ دەکەنو دڵ ساردو پەژارەو غەمگین دەبێت.

**مەچەکی دەست :** لێکدانەوەی مەچەك لەخەودا، کەسێکی دۆستو شەریكو یایەخدارە. ئەگەر ببینێ مەچەکی دەستی گەورەو بەهێزبێت ئەوا لە هاورێ یان شەریکێکەوە سودو قازانجی پێ دەگاتو بە پلەو پایەی دەگەیەنێت. ئەگەر ببینێ مەچەکی بشکێو داکەوێت ئەوا هاورێکەی یان لێی جیا دەبێتەوە یان دەمرێ.

**مەککە :** ئەگەر کەسێ لەخەودا لە مەککەدابێت، بەڵگەی ئەوەیە بۆ زیارەتی ماڵی خوا دەڕوات، ئەگەر ببینێ مەککە قەرەباڵغو ئاوەدان بێت بەڵگەی ئەوەیە سەروەتو سامان بەدەست دێنێ، ئەگەر مەککە بە چۆڵەوانی ببینێ لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێ.

**مەرەکەب :** لێکدانەوەی مەرەکەب لەخەودا کارو کاسبیو بژێوی و گەیشتن بە ئارەزووەکانە، ئەگەر کەسێ لەخەویدا مەرەکەب لە کەسێکی تر وەربگرێت بەڵگەی ئەوەیە بژێوی ئەو کەسە زیاد دەکات. ئەگەر مەرەکەب جلو بەرگەکەی پیس بکات بەڵگەی ئەوەیە

زەرەرو زیان دەبینێ بەڵام ئەگەر بینەری خەوەکە کەسێکی نوسەرو ڕۆشنبیر بێت بەڵگەی ئەوەیە بە پلەو پایە دەگات.

مەنی : لێکدانەوەی مەنی لەخەودا سەروەتی بەردەوامە، ئەگەر ببینێ لە چوکی مەنی بێتە دەرەوە، سەروەتی کەسێکی پێ دەگات.

مەنجەنیق : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ بۆ شاری موسڵمانان گوللەی مەنجەنیق بتەقێنێ بەڵگەی ئەوەیە غەیبەتی خەڵکی دەکات، ئەگەر بۆ شاری کافران گوللەی مەنجەنیق بتەقێنێ بەڵگەی ئەوەیە باسی کافران بەخراپی دەکات، ئەگەر ببینێ مەنجەنیقەکە بشکێ بەڵگەی ئەوەیە خەڵکی ئەو شارە پارێزراو دەبن.

مەسینە : بینینی مەسینە لەخەودا مانای ژنێکی خزمەتکارە وە هەندێك دەڵێن مەسینە خزمەتگوزاری گروپێکە قسەی وەردەگرن‌و بەرەنگاری نابنەوە وە ئەگەر لەخەودا بینی مەسینەیەکی تازەی هەبو وەیان کەسێك مەسینەیەکی تازەی پێ بدات خزمەتکار یان بەندەیەك بەو دەبەخشن وە ئەگەر ببینێ مەسینەکەی بشکێ خزمەتکارەکەی نەخۆش دەکەوێت یان دەمرێت وە ئەگەر ببینێ مەسینەکەی وون ببێ خزمەتکارەکەی هەڵدێ‌و لێی جیا دەبێتەوە.

میزکردن : ئەگەر کەسێ ببینێ لەجێگایەکدا کە شوێنی میزکردن نییەو میز بکات، گەر غەمگین‌و قەرزاربێت لە پەژارە دەرباز دەبێت‌و قەرزەکانی دەداتەوە وە ئەگەر سەروەتمەندو بەتوانابێت بە ئەندازەی ئەو میزە لەدارایی یەکەی کەم دەبێتەوە.

مشار : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ بە مشار درەختێك دەبڕێتەوە لە هەڵسوکەت کردنی ئەوە کەسەکە خاوەنی ئەو

درەختەیە دوردەکەوێتەوەو ئازار بەو کەسە دەگەیەنێت، وە ئەگەر ببینێ کوڕ یان برا یان خوشکی خۆی بە مشار بیبڕێتەوە لەتی بکات کوڕ یان خوشکی تری وەکو ئەوان پەیدا دەبێ.

مو : لێکدانەوەی مو لەخەودا بۆ پیاوان پەژارەو خەمەو بۆ ژنان ئارایش‌و جوانکارییە. موی ئاژەڵەکان لەخەودا سەروەتی ئەندەکە، ئەگەر کەسێکی دەروێش لەخەودا ببینێ موی سەری درێژ ببێت بەڵگەی ئەوەیە دیانەتی چاکی هەیە بەڵام ئەگەر دەروێش نەبێت بەڵگەی غەم‌و پەژارەیە.

مرواری : لێکدانەوەی مرواری لەخەودا ژن یان کەنیزەکێکی جوانە، ئەگەر لەخەودا ئەندازەیەکی زۆر مرواری هەبێت ئەوا بەو ئەندازەیە سەروەت‌و سامانی دەست دەکەوێت.

مزگەوت : لێکدانەوەی مزگەوت لەخەودا ئەگەر تازە بێت زانایەکە کە خەڵکی ڕێنمونی دەکات بۆ سەر ڕێگەی ڕاست، ئەگەر ببینێ مزگەوتێك بکاتەوە بەڵگەی ئەوەیە چاکە لەگەڵ موسڵماندا دەکات.

مناڵ بوون : ئەگەر لەخەودا ببینێ ژنەکەی کچێکی ببێت ئەوا خێروچاکەی پێ دەگات‌و لەلایەن خێزان‌و خزمەکانییەوە خۆشحاڵ دەبێت. ئەگەر ببینێ ژنەکەی کوڕێکی ببێت ئەوا پەژارەو غەمگین دەبێت. ئەگەر پیاوێك لەخەویدا ببینێ هاوسەرەکەی کوڕێکی ببێت لەهەمان کاتدا ژنەکەی حامیلە بێت ئەوا کوڕێکی دەبێت وە ئەگەر حامیلە نەبێت ئەوا ئەو پیاوە بە زەحمەتی زۆرەوەو لە ماوەیەکی

دوورودرێژدا شت بەدەست دێنێ بەڵام ئەگەر ببینێ کچی ببێ ئەوا قازانجی زۆرتر دەبێت.

منارە : لێکدانەوەی منارە لەخەودا پیاوێکە کە خەڵکی بۆ رێگای راست رێنمونی دەکات، ئەگەر لەخەودا منارەیەك دروست بکات بەڵگەی ئەوەیە کارێك دەکات کە دەبێتە هۆی کۆبونەوەی موسڵمانان، ئەگەر لەخەودا منارە تێك بدات بەڵگەی ئەوەیە کارێك دەکات کە دەبێتە هۆی بەش بەشکردنی موسڵمانان وەیان هەندێکیش دەڵێن بانگ دەری ئەو منارەیە دەمرێت.

منداڵی : ئەگەر کەسێ لەخەویدا منداڵ ببێتەوە ئەوا دوچاری غەمو پەژارە دەبێت چونکە منداڵ چاکیو خراپی لەخۆیاندا دەست نیشان ناکەن هەندێکیش دەڵێن وەزعی خراپ دەبێت.

مراوی : بەهەر ئەندازەیەك مراوی لەخەودا ببینێ بەو ئەندازەیە سەروەتو سامان بەدەست دێنێ، بە تایبەت ئەگەر لەماڵەکەی یان موڵکی خۆیدا بیبینێ. ئەگەر ببینێ ژمارەیەکی زۆر مراوی لەماڵ یان کۆڵانەکەیدا کۆببنەوەو قاوقیو بکەن لەو گەڕەکەدا بەڵایەك روودەدات، ئەگەر ببینێ مراوییەکان قسەی لەگەڵدا بکەن بەهۆی ژنێکی سامان دارەوە بۆ سەفەر دەڕوات‌و لەو سەفەرەدا سەروەت‌و سامانی دەست دەکەوێت.

مریشکی ماڵی : بینینی مرشکی ماڵی لەخەودا بەڵگەی خزمەتکارو کەنیزەکە. ئەگەر ببینێ مریشکی ماڵی هەبێ خزمەتکارێك پەیدا دەکات وەیان کەنیزەکێك دەکرێت وە ئەگەر

ببینێ ژمارەیەکی زۆر مریشکیماڵی هەبێ بەسەروەریی و گەورەیی دەگات.

مردن : هەرکەس ئەیەوێت بزانێ وەزعی لەلایەن خواوە چۆنە، پێویستە ببینێ کەسانی چاك و خێرخواز لەگەڵ ئەودا بە چ شێوازێك قسە دەکەن. ئەگەر ببینێ مردوەکان بەچاکی قسەی لەگەڵدا بکەن و خۆشحاڵ بن، بەڵگەی ئەوەیە لەلای پەروەردگار کەسێکی چاکە بەڵام ئەگەر قسەی ناشیرین و ناخۆشیان کرد لێکدانەوەکەی پێچەوانە دەبێت.

موسڵمان بون : ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ موسڵمان ببێ و لە پێشیشدا موسڵمان بوبێت، بەڵگەی ئەوەیە کارەکانی رێك بەند دەبێت، ئەگەر ببێتە کافر دوچاری بەڵایەك دەبێت، ئەگەر ببینێ کافرێك بەدەستی ئەو موسڵمان بێت بەڵگەی ئەوەیە کەسێك لە گوناح و تاوان دەگێڕێتەوە.

مینبەر : لێکدانەوەی مینبەر لەخەودا پاشایەکی موسڵمانە، ئەگەر ببینێ بچێتە سەر مینبەر و وتار بدات دەبێتە جێگەی رێزو بایەخی پادشا بەڵام ئەگەر خۆی زانا نەبێت یەکێ لە خزمەکانی دەبێت بەزاناو سودی لەلایەن پادشاوە پێ دەگات، ئەگەر ببینێ لەسەر مینبەردا باس و خواسی ناشەرعی باس بکات یان شیعر بڵێت بەڵگەی ئەوەیە کافر و رسوا دەبێت هەندێکیش دەڵێن دارکاری دەکەن، ئەگەر پادشا ببینێ لەسەر مینبەردا بێت و مینبەرەکە بشکێ وە یان بکەوێتە خوارەوە بەڵگەی ئەوەیە لەسەر کار لادەبرێت.

مقەست : لێکدانەوەی مقەست لەخەودا کەسێکە کەشت بەش بەش دەکات. ئەگەر ببینێ موی خۆی یان جلو بەرگەکانی بە مقەست ببڕێت ئەوا لێکدانەوەکەی چاکە، ئەگەر مقەستی پێ بدەن ئەوا منداڵی دەبێت.

مشك : مشك لەخەودا بەڵگەی ژنێکی دوو ڕووە کە لە ناوەڕۆکدا فاسدو بەدکارە بەڵام لە ڕوکەشدا پاكو داوێن پاك دەکەوێتە بەرچاو. ئەگەر ببینێ مشك بگرێت لەگەڵ ژنێکی وەهادا هاوسەرگیری دەکات ئەگەر ببینێ ژمارەیەکی زۆر مشکی یەك ڕەنگ لەماڵەکەیدا کۆببنەوە بەو ئەندازەیە ژنان لەماڵەکەیدا کۆ دەبنەوە.

مێش : بینینی مێش لەخەودا خەڵکی خراپو ناپەسەندە، ئەگەر ببینێ مێش دەورەی لێدابێ لە کەسێکی دەست بڵاو سەروەت بەدەست دێنێ، ئەگەر ببینێ مێش بچێتە ناو گوێچکەیەوە لە کەسێکی خراپو هەڵەشەوە قسەی ناشیرین دەبیسێو غەمبار دەبێ.

مێشولە : لێکدانەوەی مێشولە لەخەودا پیاوی زەلیلو لاوازە کە کاری بچوكو ناجۆر ئەنجام دەدات. ئەگەر ببینێ لەگەڵ مێشولەدا شەڕبکات لەگەڵ پیاوێکی لاوازدا بەشەڕدێت. ئەگەر ببینێ مێشولە بەگەرویدا چووە خوار لەگەڵ پیاوێکی لاوازو بێ ئەقڵدا بە کارێکی بچوكو بێ بایەخەوە سەرگەرم دەبنو لەو پیاوەشەوە سودێکی کەمی پێ دەگات، ئەگەر ژمارەیەکی زۆر مێشولە لەسەر لەشی کۆببنەوەو لەشیان گەزی خەڵکانی نەفام لەپاش ملە قسەی پێ دەڵێنو زیانی پێ دەگەیەنن چونکە مێشولە خوێنی خەڵکی دەمژێت. ئەگەر ببینێ

مێشوله چووه ناو گوێچکەو لوتییەوەو بووه هۆی ئازارو ئەشکەنجەدانی ئەوا لە خەڵکی لاوازەوە ئازارو ناڕەحەتی پێ دەگات.

**مێشك** : ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ مێشکی بکەوێتە سەر زەوی بەڵگەی ئەوەیە سەروەت و سامانی لەکیس دەچێت، ئەگەر ببینێ مێشکی لەسەر زەوی کۆ بکاتەوەو بیخاتەوە جێگەی خۆی، بەڵگەی ئەوەیە سەروەت و سامان بەدەست دێنێ.

**میوانی** : لێکدانەوەکەی میوانی لەخەودا کۆبونەوەیە بۆ گفتوگۆکردن، ئەگەر گروپێك بۆ میوانی دەعوەت بکات بەڵگەی ئەوەیە بە کارێکەوە سەرگەرم دەبێ و دەبێتە هۆی دواکەوتنی لەکارەکانی تر، ئەگەر بە میوانی بانگ هێشتیان کرد بۆ باخێکی سەر سەوزو پڕ لەمیوە بەڵگەی ئەوەیە لەجەنگدا شەهید دەبێت.

**میوە** : ئەگەر کەسێك لەخەودا میوەی تازەو شیرین بخوات، سودو قازانج دەبینێ، ئەگەر ببینێ میوە لەدرەختێك بکاتەوە، بە ئەندازەی ئەو میوەیە سودو قازانج دەبینێ، ئەگەر ببینێ میوە لەدرەختەوە بەربێتەوەو بکەوێتە بەر پێی بەڵگەی ئەوەیە بەبێ ناڕەحەتی سەروەت و سامان بەدەست دێنێ.

**مقاش** : مانای مقاش لەخەودا، خزمەتکارێکی دلێرە، کەماڵ لە پاشا دەسێنێت و دەیدات بەهەژاران، ئەگەر لەخەودا ببینێ بە مقاش شتێکی لە ئاگرهێنایە دەرو دای بەخەڵکی لەلایەن پاشاوە سودێکی پێ دەبەخشرێ.

**ملوانکە :** ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ ملوانکەی زیو یان ئاڵتونی لەمل دابێت ئەوا بە ئەندازەو نرخی ئەو ملوانکەیە دەسەڵات بەدەست دێنێ.

**مۆرکردن :** ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ گڵ مۆر بکات بەلگەی ئەوەیە شادیو کامەرانی دەبینێ، ببینێ کەسێکی گەورەو بەڕێز پێی بڵێ برۆ مۆر لە قاسەکە بدە بەلگەی ئەوەیە ئەو کەسە قاسەی پێ دەسپێردێت، ئەگەر ببینێ پادشا مۆری پێ بدات بەلگەی ئەوەیە ئارەزووەکانی بەدی دێت.

**مۆم :** لێکدانەوەی مۆمی سپی لەخەودا سەروەتو سامانە، مۆمی زەرد نەخۆشییە، ئەگەر ببینێ مۆمەکەی وون ببێ لەسەروەتی کەم دەبێتەوە، بەگشتی بینینی مۆم لەخەودا بەهەر ڕەنگێك بێت سەروەتو خێرە بەڵام ڕەنگی سپی باشترینیانە، ئەگەر ببینێ مۆم بە ئاگر بسوتێنێ بەلگەی ئەوەیە پادشا دەست بەسەر سەروەتەکەیدا دەگرێت، ئەگەر ببینێ مۆم بدات بەخەڵکی بەلگەی ئەوەیە پارەی خۆی خەرج دەکات بۆ کارە خێرەکان.

**مۆم :** لێکدانەوەی مۆم لەخەودا کامەرانیو فەرمان ڕەواییو پلەوپایەیە. ئەگەر ببینێ بە دەستی خۆی مۆم دابگیرسێنێ، ئەوا پلەوپایەو بژێوی زیاد دەکات، ئەگەر ببینێ لە ماڵەکەیدا مۆمێك داگیرسابێتو بە ڕوناکی مۆمەکە ماڵەکەی ڕوناك بوبێتەوە ئەوا لەو ساڵەدا نیعمەتی زۆری دەست. دەکەوێت. ئەگەر ببینێ مۆمێکی داگیرساوی لەکەسێك وەرگرت ئەوا لە لایەن کەسێکەوە پلەوپایەی دەست دەکەوێت. ئەگەر ببینێ کەسێك مۆمێکی داگیرساوی بە مۆم

دانەکەوە پێ بدات ئەوا لە لایەن هۆزێکی گەورەوە ژنێك دەهێنێ بە شێوەیەك ئەگەر مۆم دانەکە زیوی بێت ئەو ژنە صالحو چاك دەبێت. ئەگەر ئاڵتونی بێت ئەوا لە خێزانێکی بەتواناو بەهێزە، ئەگەر قورقوشمی ببێت ئەوا مەلازادەیە وە ئەگەر سفاڵی بێت ئەوا لە خەڵکی ئاسایی دەبێت.

مۆمیایی : لێکدانەوەی خواردنو بینینی مۆمیایی لەخەودا غەمو پەژارەیە.

مۆرانە : زیندەورێکە کە هاوینان لە هەوای گەرمدا لە جلوبەرگی خوری دا پەیدا دەبنو بینینی لەخەودا دراوسێی دزە. ئەگەر ببینێ مۆرانە جلو بەرگەکەی خواردبێ ئەوا دز سەروەتو ماڵی دەدزێ وە ئەگەر ببینێ مۆرانەکە بکوژێت ئەوا دزەکە دەدۆزێتەوەو داراییەکەی خۆی لێ دەسەنێتەوە.

منداڵ : ئەگەر کەسێك لەخەویدا کچی ببێت ئەوا سەلامەتیو تەندروستی بەدەست دێنێت. ئەگەر ببینێ کوڕێکی ببێت لێکدانەوەکەی پێچەوانەیەو کچێکی لە هاوسەرەکەی دەبێت وە ئەگەر لەخەودا کچی ببێت ئەوا کوڕێکی لە هاوسەرەکەی دەبێت.

مس : ئەگەر کەسێ لەخەویدا مسی هەبێت بەڵگەی ئەوەیە بەو ئەندازەیە سەروەتو سامان بەدەست دێنێ.

## پیتی ( ن )

**نارنج :** ئەگەرکەسێ لەخەویدا ببینێ نارنجی هەبێت وەژمارەی نارنجەکان لەیەکەوە تا سێ بێت بەڵگەی منداڵە ئەگەر لەوژمارەیە زیاتر بێت بەڵگەی سودووقازانجە.

**نارگیل :** ئەگەر کەسێك لەخەویدا ببینێت نارگیلی هەبێت بەڵگەی ئەوەیە لەبارەی ئەستێرەناسیەوە قسە دەکات.

**نینۆك :** لێکدانەوەی نینۆك لەخەودا، هێزوتوانایە، ئەگەر ببینێ نینۆك بەمقەست بکات بەڵگەی ئەوەیە دین و ئیمانی بەهێز دەبێت.

**ناوك :** لێکدانەوەی بینینی ناوك لە خەودا ژن یان کەنیزەکە، ئەگەر ببینێ ناوکی بکەوێتە خوارەوە بەڵگەی ئەوەیە ژنەکەی تەلاق دەدات وە ئەگەر ببینێت ناوکی گەورە ببێت بەڵگەی ئەوەیە سەروەت و سامان بەدەست دێنێ وەئەگەر پێچەوانەکەی ببینێت لێکدانەوەکەشی پێچەوانەدەبێت، ئەگەرببینێ ناوکی کۆن ببێت بەڵگەی ئەوەیە لەکاروباری ژن و مێردایەتیدا کەم و کورتی هەیە.

**ناوچەوان (تەویل) :** بینینی ناوچەوان لەخەودا رێزو پلەوپایەی خەڵکییە چونکە سوجدەی خودای پێ دەکرێ. ئەگەر ببینێ ناوچەوانی نیشانەیەکی پێوەبێت ئەو کەسە بە پاك دامێنیو رەوشتبەرزی بە ناوبانگ دەبێت وە ئەگەر کەسێ ببینێ ناوچەوانی برینی لێ بێتو خوێنی پیا بێتە خوار، رێزو پایەی بەرزدەبێتەوە.

وە ئەگەر ناوچەوانی بچوك بێتەوە تەعبیرەکەی پێچەوانەی ئەوەیە، وە ئەگەر ناوچەوانی بگۆڕێت بۆ شێوەیەکی تر زیانێکی لێ دەکەوێت، وە ئەگەر لەناوچەوانی مووی لێ بڕوێت قەرزار دەبێت وە ئەگەر ئەو مووە سوربێت قەرزاری ژنەکەی دەبێت. وە ئەگەر ناوچەوانی دومەڵی لێ بێت سەروەت‌و سامانی زۆر دەبێت، ئەگەر ببینێ لە ناوچەوانییەوە مارو دوپشك یان هەر شتێکی لەو بابەتانە بێتە دەرەوە ڕەنج‌و زەحمەتی پێ دەگات.

نالەی مردو : ئەگەر کەسێك لەخەویدا ببینێ مردویەك نالە دەکات بەلگەی ئەوەیە ئەو کەسە لەدنیادا کەسێکی بەدکارو خراپ بوە، ئەگەر ببینێ کەسێکی مردو بەهۆی سەرئێشەوە بناڵێ بەلگەی ئەوەیە ئەو کەسە لەدنیادا کەسێکی خۆ بەزل زان بووە، ئەگەر لەتاو ئازاری چاو بناڵێ لەدنیادا سەیری ناموسی خەڵکی کردوە، ئەگەر لەتاو دەردی گوێ بناڵێ بەلگەی ئەوەیە گوێی بۆ غەیبەت کردنی خەڵکی شل کردوە، ئەگەر لەناو دەردی ددان بناڵێ بەلگەی ئەوەیە لەگەڵ ژنانی هەرزە خراپەکاردا هەڵسوکەوتی ناشەرعی کردوە، ئەگەر لەتاو دەردی سك بناڵێ بەلگەی ئەوەیە کەسێکی حەرام خۆربوە.

نامە : ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ نامەیەکی داخراو یان مۆرکراوی هەبێت بەلگەی ئەوەیە قسەیەکی نهێنی دەبیستێ

نان : نانی پاکو خاوێن لەخەودا بەلگەی کامەرانی و خۆش حاڵی یە ئەگەرنانەکە ناپەسەندبوو بەلگەی ئەوەیە دووچاری زیانێکی ناپەسەند دەبێتەوە. ئەگەرببینێ نان بکڕێت و بیبات بۆماڵەوە

بەلگەی ئەوەیە بژێوی حەلاڵ بەدەست دێنێ و سامانی زیاد دەکات، ئەگەربیبینێ نان بەکەسێك بدات بلگەی ئەوەیە خزمەت بەوکەسە دەکات.

ناشتن (وەشاندن) : دانیاڵ (ع) دەڵێ : لێکدانەوەی ناشتن‌و دورینەوەی هێشوی پێگەیشتو لەخەودا ئەگەر لەوەرزی خۆیدابێت بەلگەی سودو قازانجە بەلاّم ئەگەر هێشوی کاڵ‌و نەگەییوبێت بەلگەی نەخۆشی کۆلێرا یان نەخۆشی ترە. ئەگەر ببینێ لەکاتی گونجاودا ناشتن‌و درەوەی کرد بەلگەی ئەوەیە فەرمانەکانی پەروەردگار ئەنجام دەدات.

ناڵ : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ناڵی ئەسپی هەبێت بەلگەی ئەوەیە لەلایەن پاشاوە قازانجی دەست دەکەوێت، ئەگەر ناڵی هێستری هەبێت بەلگەی ئەوەیە کەسێکی گەورە یارمەتی دەدات، ئەگەر ناڵی گوێ درێژی هەبێت بەلگەی ئەوەیە لەسەفەردا پارەو پولی دەست دەکەوێت، ئەگەر ببینێ ناڵبەندی بکات بەلگەی ئەوەیە سەفەر دەکات.

نەعنا : بینینی نەعنا لەخەودا غەم‌و پەژارەیە، ئەگەر ببینێ لە زەوییەکەیدا نەعنا بڕوێت بەلگەی ئەوەیە دوچاری غەم‌و پەژارە دەبێت، ئەگەر ببینێ نەعنا هەڵبکەنێت‌و دووری بخاتەوە بەلگەی ئەوەیە ڕزگاری دەبێت لە غەم‌و پەژارە.

نەوت : بینینی نەوت لەخەودا دڵ گرێدانە بە ژیانەوە، ئەگەر ببینێ نەوت بمالێت بە لەشی خۆیدا بەلگەی ئەودیە لەگەڵ ژنێکی داوێن پیسدا جووت دەبێت، هەندێکیش دەڵێن شتێکی حەرام دەخوات.

**نگـین** : بینینـی نگـین لەخـەودا، پلەوپایـەو گەورەییـە، ئەگـەر ببینێ نگینەکەی بشکێت یـان وون ببـێ بەڵگـەی ئەوەیـە لەسـەروەتی کەم دەبێتەوە یان منداڵی دەمرێت.

**نوێژ** : ئەگەر لەخەودا ببینێ ڕوو بە مەککە نوێـژ بکات بەڵگـەی ئەوەیـە بـۆ حـەج دەڕوات وە ئەگـەر بـۆ حـەج نـەڕوات بەڵگـەی ئەوەیـە حـەزی لـە دینـی مەسـیحە، ئەگـەر ڕووەو خۆرئـاوا نوێـژ بکـات بەڵگـەی ئەوەیە حەزی لەدینی یەهودییە، ئەگەر ڕووەو باکور نوێژ بکات بەڵگەی ئەوەیە پشت دەکاتە دین، ئەگەر ببینی نوێژ بکات بـەڵام نـەزانێ قیبلـە لە کوێوەیە بەڵگەی ئەوەیە لە کاروباری دینی دا سەرگەردان دەبێت.

**نەخۆشی** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا بینی نەخۆشە ئەوە دینی خراپە وە لەگەڵ خەڵکیدا دوو ڕووە وە هەندێ دەڵێن لەو ساڵەدا دەمرێت، وە ئەگەر ببینێ لە نەخۆشی چاک ببێتەوەو لەماڵی خۆیدا نەبوو وە لەگەڵ کەسیشدا قسەی نەکرد، مانای ئەوەیە کە نەخۆشییەکەی درێژتر دەبێتەوەو ئەگەری مردنیشی ڕوو لە زیادبونە، بەڵام ئەگەر بینی لەگەڵ خەڵکیدا هەڵس و کەوت بکاتو قسە بکات بە خێرایی لە نەخۆشی چاک دەبێتەوە.

**نەهەنگ** : نەهەنگ لەخەودا پیاوی دزە. ئەگەر ببینێ نەهەنگ لە ئاودا بیباتو نوقمی ئاوی بکات لەئاودا نوقم دەبێت. ئەگەر ببینێ نەهەنگ گازی لێ بگرێت لەلایەن دوژمنەوە توشی زەرەرو زیان دەبێت.

**نیسك** : لێکدانەوەی نیسك لەخەودا خێرە چونکە ئیبراهیم خەلیل حەزی لێی بووە.

**نادیار (غایب)** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ نادیارێك لەسەفەر بگەڕێتەوە بەڵگەی ئەوەیە لەکارەکانیدا بەرەو پێش دەڕوات بەڵام کەسە نادیارەکە بۆ سەفەرێکی تر دەڕوات‌و درەنگتر هەواڵی دەبیسرێ.

**نەعامە** : لێکدانەوەی نەعامە لەخەودا پیاوی بیابانی یە وە ئەگەر نەعامە مێیە بوو ژنی بیابانی قەشەنگە. ئەگەر ببینێ نەعامە مێیەی هەبێ یان کەسێ پێی بدات ئەوا ژنێکی قەشەنگی بیابانی دەهێنێ وە یان کەنیزەکێك دەکڕێ. ئەگەر ببینێ سواری نەعامە ببێ ئەوا بۆ سەفەرێکی بیابانی دەڕوات.

**نەی : دانیاڵ (ع) ئەڵێ** : ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ بڕێکی زۆر نەیی هەبێت بەڵگەی ئەوەیە سودو قازانجێکی کەمی دەست دەکەوێت.

**نەی لێدان** : لێکدانەوەی نەی لێدان لەخەودا غەم‌و پەژارەیە وە بیستنی دەنگی نەی غەم‌و پەژارەیە.

**نێزە** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ جگە لە نێزە چەکی تری پێ نەبێت بەڵگەی ئەوەیە برا یان منداڵی دەبێت، ئەگەر لەگەڵ نێزەدا چەکی تری پێ بێت بەڵگەی ئەوەیە بڕیارو فەرمانەکانی لە شارەکاندا جێبەجێ دەکرێت، ئەگەر ببینێ نێزەکەی بشکێ بەڵگەی ئەوەیە منالْ یان براکەی دەمرێت.

**نوسەری** : ئەگەر کەسێکی زانا لەخەودا ببینێ نوسەری بکات بەڵگەی ئەوەیە قازانجی دەست دەکەوێت، ئەگەر ببینێ شیعرو ئەفسانە بنوسێ بەڵگەی ئەوەیە سەرگەرمی کاری دنیایی دەبێت، ئەگەر قورئان یان هەر بابەتێکی تری ئاینی بنوسێ بەڵگەی ئەوەیە

خێروبەرەکەتی دەست دەکەوێت، ئەگەر ببینێ کەسێکی گەورە نامە بنوسێ بەو مەرجەی کەسەکە چاکەخواز بێت بەڵگەی سودو قازانجە وە ئەگەر بەدکارو گوناحکاربێت بەڵگەی ئەوەیە تۆبە دەکات، ئەگەر ببینێ بە ڕەنگی سور بنوسێ بەڵگەی ئەوەیە سەرگەرمی گاڵتەوگەپ دەبێت، ئەگەر بەڕەنگی زەرد بنوسێ بەڵگەی ئەوەیە نەخۆش دەکەوێت، ئەگەر بەڕەنگی سەوز بنوسێ بەڵگەی ئەوەیە ناوبانگ دەردەکات، ئەگەر بەڕەنگی ئاڵتونی یان زیوی بنوسێ بەڵگەی ئەوەیە لەلایەن پاشاوە سودو قازانجی دەست دەکەوێت.

**نەوشاتر** : ئەگەر کەسێك لە خەوی دا نەوشاتری هەبێت دووچاری خەم و پەژارە دەبێت .

**نیشاستە** : ئەگەرکەسێك ببینێ لەخەودا نیشاستە بخوات بەڵگەی ئەوەیە دووچاری خەم و پەژارە دەبێت، ئەگەر ببینێ حەڵوا بەنیشاستە دروستبکات و لێی بخوات بەڵگەی ئەوەیە سودو قازانج دەبینێ، ئەگەر ببینێ لەگەنم نیشاستە دروست بکات ، بەهۆی کارو کاسپی یەوە بژێوی خۆی پەیدا دەکات.

**نزگەرە** : ئەگەر لەخەودا ببینێ نزگەرە بکات. قسەی ناشیرین‌و جنێو دەدات.

**نوقم بوون** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا لە دەریایەکدا نوقم بێ‌و بمرێت ئەوا لە لایەن پاشاوە لەناو دەچێ.

**نۆکەر** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ بوبێت بە نۆکەری کەسێك ئەوا لەبەر ئەو کارە سەختەی کە دەیکات نەخۆش دەکەوێت.

# پیتی ( هـ )

**هاوین** : بینینی هاوین لەخەودا پاشایەکی بەهێزو بە توانایە، ئەگەر ببینێ کە هاوین ئەوەندە گەرمە خەڵکی ئەو جێیە توشی زەرەرو زیان بن‌و ئازار بچێژن بەڵگەی ئەوەیە خەڵکی ئەو جێیە لە لایەن پاشاوە خێرو چاکەیان بۆ دێ. ئەگەر هاوین لە کاتی خۆیدا ببینێ پلەوپایەی بەرز دەبێتەوە وە ئەگەر لەکاتی خۆیدا نەبو تەعبیرەکەی پێچەوانەیە.

**هاوسەرگیری** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ژنی هێنا شەرەفێکی گەورەی دەست دەکەوێت وە ئەگەر زگورت‌و تەنها بێت لەگەڵ ژنێکی دەوڵەمەندا هاوسەرگیری دەکات وە ئەگەر بینی ژنەکەی تەڵاق بدات شەرەفێکی گەورەی لەکیس دەچێ وە ئەگەر بینی لەگەڵ ژنێکدا کە مردووە هاوسەرگیری بکات لەگەڵیدا جووت بوو لەسەروەت‌و سامانی ئەو ژنەی بەردەکەوێت وە ئەگەر لەگەڵیدا جوت نەبو ئەندازەیەکی کەمی لەسەروەت‌و سامانی ئەو ژنەی بەدەست دەگات، ئەگەر ژنێك لەخەویدا ببینێ پیاوێکی مردو لەگەڵیدا هاوسەرگیری کردو لەگەڵیدا جووت بوو سەروەتی ئەو ژنە ڕوو لە کەمبوون دەبێت ومیان حاڵی ئەو ژنە دژوار دەبێت وە ئەگەر پیاوێك خەوی بینی‌و ژنی هێنا بەڵام ژنەکە نەبینی‌و ناویشی نەزانی مردنی نزیك بوەتەوە، وە ئەگەر ژنێك خەوی لەوجۆرە بینی‌و بەڵام ماڵەکە نەناسراو بو وە ئەو ماڵە خاوەنەکەی مردوبێت‌و ئەو مردووە لەگەڵ ژنەکەدا جووت بو ئەوا

ئەو ژنە دەمرێت وە ئەگەر ئەو ماڵە ئاسراوبێت زیان بە سەروەت‌و سامانی ئەو ژنە دەگات.

**هەور** : ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ هەور لە ئاسماندا بڕەوێتەوە لەگەڵ زاناو گەورە پیاواندا چاوپێکەوتن‌و گفتوگۆ دەکات وە ئەگەر پادشا لەخەودا هەور ببینێت گەشتیاران‌و هەواڵنێران بۆ دەوروبەری وڵاتەکەی خۆی دەنێرێ وە ئەگەر ببینێ هەوری لە ئاسمان گرت‌و هێنایە خوارەوە کارەکانی باش‌و پلەوپایەی بەرز دەبێتەوە وە ئەگەر بینی هەر لەسەر ئەودا سێبەری دروستکرد لەو ساڵەدا خێرو کامەرانی زۆری دەست دەکەوێت.

**هەرزن** : بینینی هەرزن لەخەودا مانای ماڵ‌و ئارەزووە خواردنی هەرزن ماناکەی خراپە بەڵام ئەگەر هەرزنی فر ۆشت مانای زیان‌و زەرەرە.

**هەڵامەت** : ئەگەر ببینێ کەسێکی تر ویان خۆی هەڵامەت بگرێت ئەوا چەن ڕۆژێك نەخۆش دەکەوێت بەڵام زوو چاك دەبێتەوە وە هەرچەند هەڵامەتەکە لەخەودا کاریگەربێت ماوەی نەخۆشییەکە زیاتر دەبێت.

**هەلاجی** : هەلاج لەخەودا پیاوێکی بەهێزو توانایە کە ئازارو گرفتارییەکانی خەڵکی بەهۆی ئەوەوە چارەسەر دەکرێت. ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ هەلاجی بکات لەگەڵ پیاوێکدا کە ئەم خاسیەتانەی تێدابێت چاوپێکەوتن‌و دانیشتن دەکات.

**هەڵ هاتن (ڕاكردن) :** ئەگەر كەسێ لەخەویدا هەڵ بێت، ئەوا كامەران‌و سەركەوت‌و دەبێت چونكە موسی (ع) لەخەودا لەدەستی فیرعەون هەڵهات پاشان بەسەر فیرعەوندا زاڵبو.

**هەویر شێلان :** هەویر شێلان لەخەودا بەڵگەی دینداریيە وە شێلانی ئاردی گەنم بەڵگەی سامانێكە لە ڕێگەی بازرگانییەوە دەست دەكەوێت بەمەرجێ ئاردەكە لێی بێت واتە (ئاردەكە نانی جوانی لێ دروست بكرێت) وە ئەگەر ئاردەكە لێی نەهات بەڵگەی گوناح زۆركردن‌و تاوانە.

**هەنار :** هەناری شیرین لەخەودا كۆكردنەوەی ماڵ و سامانە، هەناری ترش لەخەودا خەم و پەژارەیە، ئەگەر هەنار لەخەوداببینێ و نەزانێ ترشەیان شیرین لێكدانەوەكەی وەكوهەناری شیرینە.

**هەنجیر :** لێكدانەوەی خواردنی هەنجیر لەخەودا خراپە، ئەگەرببینێ هەنجیربخوات یان كۆی بكاتەوە یان كەسێ پێ ی بدات بەڵگەی ونەوەیە دوچاری خەم و پەژارەدەبێت و كارێك دەكات پەشیمانی بەشوێندا دێت.

**هەنگ :** لێكدانەوەی هەنگ لەخەودا پیاوی پەست‌و مایە پوچە، ئەگەر ببینێ هەنگ پێوەی بدات پیاوی خراپ‌و مایە پوچ ئازاری دەدات وەیان قسەی ناشیرین دەبیسێ، ئەگەر ببینێ ژمارەیەكی زۆر هەنگ دەوریدابێ لە نێوان خەڵكی مایە پوچدا گرفتار دەبێ بە تایبەت ئەگەر ببینێ هەنگەكان بیگەزن.

**هەنگوین :** ئەگەر هەنگوین لەگەڵ شانەدا ببینێ بەڵگەی ئەوەیە ئیرس یان دەستكەوتێكی حەلاڵی دەست دەكەوێت. ئەگەر

ببینێ هەنگوینی هەبێ بە ئەندازەی ئەو هەنگوینە زانستو زانین بەدەست دێنێ، ئەگەر بینی لەو هەنگوینە بدات بەخەڵکی بەڵگەی ئەوەیە خەڵکی بەهرەو سودی لێ دەبەن وە ئەگەر پێچەوانەکەی ببینێ لێکدانەوەکەشی پێچەوانە دەبێت.

**هەرمێ:** ئەگەر کەسێ ببینێ هەرمێ لەوەرزی خۆیدا بخوات و هەرمێ کە سەوزو شیرین بێت بەڵگەی ئەوەیە سەروەتی حەڵاڵ بەدەست دێنێ وەئەگەر لەوەرزی خۆیدا نەبێت و هەرمێ کە زەردبێت بەڵگەی ئازارو نەخۆشیە.

**هەورەگرمەو هەورە بروسکە :** لێکدانەوەی هەورەگرمە لەخەودا خەزانەداری پاشایە. هەندێکیش لەخەوناسانْ دەڵێن هەورە بروسکە پەیمانی خراپە کە پاشا بە پیاوی تەماعکاری دەدات. ئەگەر ببینێ ڕوناکی لەهەوا یان هەور بگرێت ئەوا کارێك ئەنجام دەدات کە خێری تێدایە بۆی. ئەگەر ببینێ بروسکە بدرەوشێتەوە ئەوا لەو ساڵەدا نیعمەتی زۆر دەبێت بە تایبەت ئەگەر بایەکی ئارام لەگەڵ بروسکەکەدا بێت.

**هێلکەی مریشك :** تەعبیری هێلکەی مریشكو پەڕدارەکان لەخەودا هێزو توانایە.

**هێلەك :** مانای هێڵەك لەخەودا، ژنی فیتنە یان خزمەتکارە، ئەگەر ببینێ هێڵەکی گەورەو تازەی بەدەستەوەبێت وەیان کەسێك پێی بدات، ژنێك یان خزمەتکارێ. دەبێتە هاوڕێو خزمەتکاری.

**هاوانو دەسکەوانە :** لێکدانەوەی دەسکەوانە لەخەودا، دوو شەریکن کە لێك جیا نابنەوە، ئەگەر یەکێکی لەو دوانە بینی هیچ

سودێکی نییە ئەگەر ببینێ لە هاوانەکەدا شتێکی خواردەمەنی بکوتێت، سودو قازانجی دەست دەکەوێت، ئەگەر لە هاواندا دەرمان بکوتێت سامانێك دەدۆزێتەوە وە ئەگەر خواردنەکە شیرین بێت سودو قازانجی دەست دەکەوێت بەلام ئەگەر تاڵ بێت زەرەرو زیان دەکات.

**هەدیە** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا ببینێ هەدیە بەکەسێك بدات یان هەدیە بنێرێت بۆ کەسێك ئەوا بەو ئەندازەیە سودو قازانجی دەست دەکەوێت.

**هەوا** : ئەگەر کەسێ لەخەودا ببینێ هەوا مەیلەو سوربێت، بەلگەی ئەوەیە لەو شوێنەدا کوشتو کوشتار بەرپا دەبێت، ئەگەر ببینێ هەوا مەیلەو سەوز بێت بەلگەی ئەوەیە لەو شوێنەدا سەوزەو دانەوێڵە زیاد دەکات، ئەگەر ببینێ هەوا تەپو تۆزاوی بێت یان ساردبێت، بەلگەی ئەوەیە پاشایەکی نامۆ روو دەکاتە ئەو شوێنەو ئازارو ئەشکەنجە بەخەڵکی ئەو شوێنە دەگەیەنێت.

**هەوکردنی لەش** : لێکدانەوەی هەوکردنی لەش یان ئاوسانی لەش لەخەودا سەروەتو سامانە، ئەگەر کەسێ ببینێ لەشی هەوی کردبێ یان دومەڵی کردبێ بەلگەی ئەوەیە بەو ئەندازەیە سەروەتو سامانی دەست دەکەوێت بە تایبەت ئەگەر لە دومەڵەکەوە کیمو جەراعەتی لێ بێت.

## پیتی ( و )

والی : ئەگـەر كەسـێ لەخەویـدا ببینـێ فەقیانەكـەی یـان عەمامەكـەی بەسـترابێت بـە فەقیانـە یـان عەمامـەی والـی یەكـەوە بەلگەی ئەوەیە پلەوپایەی پارێزراو دەبێت.

وەزیر : ئەگەر كەسێ لەخەویدا ببینێ وەزیـری پاشـایەك بێـت بەلگـەی ئەوەیـە پلەوپایـەی دەسـت دەكـەوێت بـەلام ئەگـەر پاشـاكە سـتەمكار بێـت لێكدانەوەكـەی پێـچەوانە دەبێـت، ئەگـەر ببینـێ وەزیرێك جلوبەرگی پێ بدات بەلگەی ئەوەیـە دەبێتـە دەسـەلاتدارو فەرمانڕەوای جێگەیەك، ئەگەر وەزیر بێت بـۆ مـالی بەلگـەی ئەوەیـە لەلایەن پادشاوە دوچاری غەمو پـەژارە دەبێت، ئەگـەر ببینـێ لەگـەل وەزیردا خواردن بخوات ئەوا گـەورەیی‌و پلەوپایـەی دەسـت دەكـەوێت ئەگـەر مـالی وەزیـر خـراپ ببـێ یـان وەزیـر نـەخۆش بكـەوێت یـان لەسـەركار لابرێـت وە یـان ئەسـپی وەزیـرە لەقـە بـدات لـە وەزیرەكـە وەیـان لـە ئەسـپەكەی بكەوێتـە خـوارەوە، هـەمو ئەمانـە بەلگـەی لابردن‌و دەركردنی وەزیرە.

وسمـە : ئەگـەر كەسـێ لەخەویـدا ببینـێ وسمەیـەكی زۆر لەمالەكەیدا هـەبێت بەلگـەی ئەوەیـە دوچـاری غـەمو پـەژارە دەبێـت، ئەگـەر ببینـێ وسمـە لەمالەكـەی فـڕێ بداتـە دەرەوە بەلگـەی ئەوەیـە لەغەمو پەژارە ڕزگاری دەبێت.

**ویرانـی** : لێکدانـەوەی ویرانـی لەخـەودا گومڕاییـە. ئەگـەر لەخـەودا ببینێ شوێنێکی ئـاوەدان ویـران بکـات بەڵگەی ئەوەیـە لـە کاروباری دینیو دنیاییدا سەری لێ دەشێوێت.

**ورگ لێهاتن** : ئەگـەر کەسێ ببینـێ سـکی وەکـو ژنـی دوگیـان گەورە ببێ ماڵو سامان بەدەست دێنێت وە هەرچـەند سـکی گـەورەتر بێ سامانی زۆرتری دەست دەکەوێت.

**ووشـتر** : ئەگـەر کەسێ ببینـێ سـواری حوشـترێکی نەناسـراو بووبێتو بە توندی بڕوات ئەوا سەفەر دەکات، ئەگەر ببینێ بەسـەر حوشـترەوە کێبڕکـێی کـرد غـەمگینو پـەژارە دەبێـت، ئەگـەر ببینـێ بەسـەر حوشـترەوەیەو ڕێگای وون کـردو ڕێگاکـەش نـەزانێ ئـەوا بـە ماتەمی دەمێنێتەوەو چارەسەری کاری خۆی پێ ناکرێ، ئەگەر ببینـێ حوشترێکی مێیـەی پەیدا کـرد ژن نـەهێنێ وە ئەگـەر حوشتر لەگەڵ بێـچووەکەی دابـوو ئـەوا ژنێـك دەهێنـێ کـە منـداڵی هـەبێت. ئەگـەر ببینێ حوشتر ڕووی تێ نەکاتو گوێڕایەڵی نەکات ئەوا توشی پـەژارە دەبێت.

**وورچ** : لێکدانـــەوەی وورچ لەخـــەودا دوژمنـــی زەبـــونو دزو بێمێشکە. ئەگەر ببینـێ سواری وورچ بوبێـت لەلایـەن پادشاوە لاریو ئازار دەبینێ وە ئەگەر ببینـێ وورچـەکە بکوژێـت زاڵ دەبێت بەسـەر دوژمندا وە ئەگـەر گۆشتی وورچـەکەی خـوارد ومیان پێستەکەی لێ کردەوە بۆ خۆی دوچاری ترس دەبێتەوە.

**وون بون** : ئەگەر کەسێ لەخەویدا وون ببێت، بەڵگەی ئەوەیە سەرگەردان دەبێتو هیچ کەس قەدری ناگرێت، ئەگـەر هاوسـەرەکەی

